تصوير ابو عبدالرحمن الكردي

# تاریخی بەنرخ

دانراوی

حاجی مامۆستا مەلا عارف مودەڕیسی - بالک مەریوان

نەخت و پوختی کەین بۆ چاپ کردنی — لایەن گیری کەین لە لابردنی

عارف هەژار و گێل و فەقیرە — لە گەڵ ناکامی خۆیا دەرگیرە

هەرچی نەزانم نە ینوسم وەک گوڵ — با لە گەڵ خۆما نەیبەمە ژێر گڵ

تۆیش هەر وەکو من هەرچی نەزانی — بینوسە بۆمان هەر جۆر نەتوانی

لەوە پێش کەسێ کە حیکایەت خووان بووایە لە پێشا ئەمانیە ئەووت بۆ ئەوە باشی گوێی لێ گرن

منیش کە حیکایەتی تەئریخ ئەکەم ئەمانە ئەنوسم یەکێ بوو یەکێ نەبوو کەس لە خوا گەورەتر نەبوو کۆسە مردن کفنی نەبوو

نایان بە تاقۆ چاوی چوو بە زاقۆ ، نایان بە سرمیچۆ دەدانی چوو بە ڕیچۆ ،

من نازانم ئەمانە کێ ووتویە بۆچی وتراوە ، هەرکەسێ هەرچێ ئەزانێ لە ڕوی دەلیلۆ بینوسێ بۆمان مەمنونی ئەبینو بلاوی ئەکەینۆ

## (بەناوی خوای گەورە و میهرەبان)

## ئەم کتێبە لە پێنج بەش پێک هاتووە

## بەشی ئەووەڵ

### باسی پێغەمبەران _سەلامی خوایان لەسەر_

ئەم باسی پێغەمبەرانە لە کتێبی «بنەماڵە پاکەکان»ی حاجی مەحموودی دیتولاتیدا هێناومە و ئەویش لە کتێبە کۆنەکانۆ نەقڵی کردووە، کە کتێبێکی زۆر چاک و بەنرخە خۆزگا هەموو ماڵێکی کوردەواری ئەو کتێبەیان بوایە و لەبەریشیان بکردایێ. جا ئەو کتێبە لە باوکی هەموو بەشەر حەزرەتی ئادەمەوە دەس پێدەکات، ئێمەیش ئەو باسە ئەنووسین تا حەزرەتی نووح سەلامیخوایانلەسەر- کە دە (١٠) پشتە و باقی پێغەمبەرەکان ئەوە حاجی ئەحمەد نووسیویەتی ئەمما من بە شێوەیێکیترو لەکاناڵێکی ترەوە ئەی نووسمەوە.

### ١. حەزرەتی ئادەم باوکی هەموو بەشەر

٥٥٩٤ ساڵ بەر لە میلادی حەزرەتی عیسا -سەلامیخوایانلەسەر- هاتووەتە سەر زەوی، یالی ٦٢١٦ ساڵ بەر لە هیجرەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ وەکوو ئەڵێن حەزرەتی ئادەم ٩٣٠ ساڵ لەسەر زەویا ژیاوە و ٥٢٨٦ ساڵ پێش لە هیجرەت کۆچی دوایی کردووە و لە«سەرەندیب» وەیا لە کێوی «ئەبوقوبەیس» ئەسپەردەی خاک کراوە و ئەوە و ئەبیرەی زۆری بەجێ هێشتووە.

### ٢. حەزرەتی شیث

حەزرەتی شیس یەکێ بووە لە کورەکانی حەزرەتی ئادەم – سەلامیخوایانلەسەر- کە «هبةالله» لەقەبی بووە. دوای ٢٣٥ ساڵ ماتەوەی باوکی لەسەر زەویا لە دایکە حەووا لەدایک بووە و بووە بە پێغەمبەری خوا و ٥٠ دانە سوحوفی لای خواوە بو هاتووە و ٩١٢ ساڵ لەسەر زەویا ژیاوە و قەبری موبارەکی لە مووسڵە.

## ٣. حەزرەتی ئەنووش

ئەنووش کوڕی حەزرەتی شیسە و ٩٠٥ ساڵ ژیاوە.

## ٤. حەزرەتی قەینان

قەینان کوڕی ئەنووشە و ٩٠٥ ساڵ عومری کردووە.

## ٥. حەزرەتی مەهلائیل

کوڕی قەیناتی کوڕی ئەنووشە، ٨٩٠ ساڵ لەم دونیادا ژیاوە و لە ساڵی ١٢٩٠ هبوت، یانی بەزەوی هاتنی ئادەم لە دونیا دەرچووە.

## ٦. حەزرەتی یەرد

کوڕی مەهلائیل، ٩٦٢ ساڵ عومری بووە.

## ٧. حەزرەتی ئوخنووخ

ئوخنووخ کە بە ئیدریس نەبی بەناوبانگە، کوڕی یەردە کە لە ساڵی ١١٢٠ لەپاش هبوتی ئادەم بۆ سەر زەوی لە ناوچەی میسر و بە قەولێ لە بابل لەدایک بووە، لەپاش ٣٦٥ ساڵ عومر، لە ساڵی ٤٩٤٠ی بەر لە هیجرەت لە دونیا دەرچووە. خوا روتبەی بەرزی پێغەمبەری و زانیاری بەو عەتا کردووە. ئەڵێن: حەزرەتی ئیدریس هەوەڵ پێغەمبەرێ بووە کە بە ئەمری خوا بە شێوەی تێکوشان مەئمووری ئیبلاغی ئایینی خواپەرستی بووە. ئیدریس یانێ زۆر دەرس‌وێژ و لەقەب بووە بۆ ئوخنووخ. ئەم پێغەمبەرە لای خواوە ٣٠ دانە سوحوفی بۆ هاتووە. مامۆستا مەلا عبدالکریم مودەڕڕیس لەبارەی سوحوفەکانەوە وای فەرمووە:

دە لەبۆ ئادەم، پەنجا لـەبـۆ شیـس

دە بۆ ئیبراهیم، سی لەبۆ ئیدریس

وا دیارە ئەم سەد سوحوفە پەڕە پەڕە هاتوونەتە خوارەوە بۆیە پێیان ئەووت «صحف».

## ٨. حەزرەتی «متوشلخ»

کوڕی حەزرەتی ئیدریسە و ٩٦٩ ساڵ عومری کردووە و ٤٥٦٠ ساڵ بەر لە هیجرەتی حەزرەتی موحەممەد ـدروودی خوای لەسەرـ کۆچی دوایی کردووە.

## ٩. حەزرەتی لەمەک

کوڕی متوشلخە، ٧٧٧ ساڵ عومری بووە.

## ١٠. حەزرەتی نووح

کوڕی لەمەک و دایکی ناوی شەمخا بووە، ١٦٤٢ ساڵ دوای هبووتی ئادەم بۆ سەر زەوی لەدایک بووە و ١٠٤٠ ساڵ عومری بووە، لە ئاخری عومریا لێیان پرسی ئەم دونیاتە چۆن هاتە بەرچاو؟ وتی: ژیانی ئەم دونیا وەک ماڵی دوو دەرگا وایە لەم دەرگاوە ئەڕۆیتە ژوورەوە و لەویانۆ ئەچیتە دەرەوە. حەزرەتی نووح بەنۆ پشت ئەچێتۆ سەر حەزرەتی ئادەم ـسەلامی خوایان لەسەرـ وە ئادەم ئەبێ بە ٣٩هەمین جەدد و باپیرەی حەزرەتی محەممەدی موستەفاﷺ. تووفانی حەزرەتی نووح موزی تەواوی میللەت و ئەدیانەکان یوونی ئەویان قبووڵ کردووە، لە ساڵی ٢٢٤٢ی هبووت یانی ٢٩٧٦ی بەر لە هیجرەت بووە، کە ڕێکەوتە لەگەڵ ساڵی ٣٢٥٢ی بەر لە دونیا هاتنی عیسا بەرانبەر تەوراتی یونانی.

باسی پێغەمبەران لەسەریان بێ سەلامی خوا، وەکوو من ئەزانم ئێوەش بزانن کە لەم کوردەواری خۆمانا پێنج پێغەمبەر مەرقەدیان هەیە:

١. لە قەڵای کەرکووک دوو پێغەمبەر هەن لای پردی خاسە بەناو «دانیال» و «یەحیا».

٢. لە مووسڵ دوو پێغەمبەر هەن بە ناوەکانی «شیث» و «یۆنس».

٣. لە تووێسرکان حەزرەتی «حەیقوق» کە ٥٠ ساڵ بەر لە ئێستە کە ساڵی ١٣٨٨ لە شاری چکۆلەی تووێسرکانا لە ژێر خاکا دۆزراوەتەوە و وەکوو ڕۆژنامەکان نووسیبوویان ئەو پێغەمبەرە دوای ٢٦٠٠ ساڵ فەوتی، سالم لە ژێر

خاكا دەریان هێنا و له پێغەمبەره بەنی‌ئیسرائیلییەكانە و له نەتەوەی حەزرەتی مووسایە. ئەڵێن له شووشتەر پێغەمبەرێ‌تر هەیە.

وەكوو ریوایەت كراوە: سوحوفی ئیبراهیم له هەوەڵی رەمەزانۆ له ئاسمان هاتووەته خوارەوە بۆ ئیبراهیم. با بزانین حەزرەتی ئیبراهیم دوو ژنی بووە: یەكێ سارا خاتوونی دایكی حەزرەتی ئیسحاق، دووەم هاجەرە خاتوونی دایكی حەزرەتی ئیسماعیل لەسەر هەموویان بێ سەلامی خوا. كه ئیسماعیل و دایكی چۆڵی مەككەیان ئاوەدان كردەوە بوو به موڵكیان.

تەورات له شەوی شەشەمی رەمەزانا هاتووەته خوارەوە بۆ مووسا ٧٠٠ساڵ دوای سوحوفی ئیبراهیم. زەبوور له دوازدەی رەمەزانا هاتووەسە خوارۆ بۆ داوود ٥٠٠ساڵ دوای تەورات. ئینجیل له هەشتی مانگی رەمەزانا هاتووەسە خوارەوە بۆ عیسا ١١٠٠ساڵ دوای زەبوور. وە قورئان له بیست‌وحەوتی مانگی رەمەزانا هاتووەسە خوارەوە بۆ حەزرەتی موحەممەد -لەسەرهەموویان‌بێ‌سەلامی‌خوا- ٦٢٠ساڵ دوای ئینجیل (درّةالواعظین لاپەڕەی١٨)

«صلوةالتلفسین» بەرگی٣ لاپەڕەی٢٨ له سوورەتی «صافات» ئایەتی٨٣ دا ئەڵێ: بەینی حەزرەتی نووح و ئیبراهیم ٢٦٤٠ساڵ بووە و له بەینی ئەوانا ئەم دوو پێغەمبەرە حەزرەتی هوود و ساڵح بوون. ئەڵێن: ئیبراهیم ئەسڵەكەی «اب‌رحیم» بووە یانێ باوكی به رەحم. وە هەروەها له هەمان سەرچاوە بەرگی ٢ لاپەڕەی٤٢٧ سوورەتی «صافات» هاتووە كه: بەینی عیسا و موحەممەد ٦٠٠ساڵ بووە.

به تاقیقاتێ كه مەحموودپاشای فەلەكی كردوویەسی لەدایك بوونی حەزرەتی موحەممەدﷺ له بەیانی دووشەممەی نۆهەمی مانگی مەولوودا بووە كه رێكەوتی بووە لەگەڵ ٢٠ ئیبریلی ساڵی ٥٧١ میلادی كه هەر لەو ساڵا بەسەرهاتی «اصحاب‌الفیل»یش قەوماوە. وەكوو سوورەتی «فیل» باسی ئەكا.

ئەووەڵ جار وەحی هات بۆ پێغەمبەری ئیسلام له ئەووەڵی مانگی فبرایرا بوو له ساڵی ٦١٠ میلادی، وەكوو رۆشنی كردووەسۆ بۆ ئێمە خواڵێ‌خۆشبوو

مەحمووپاشای فەلەکی. وە دوای باس و بەیانی زۆر ڕۆشن بووەتۆ کە لەدایک بوونی پێغەمبەرﷺ لە ١٧ ڕەمەزانا بووە، ٥٣ ساڵ پێش هیجرەت وە کە وەحی دەستی پێ‌کرد، وە بە خەو بینی ڕاس بووە، وەکوو کتێبی «نورالیقین» لە لاپەڕەی٢٦دا نوسیویەتی.

ئەووەڵی هیجرەتی پێغەمبەر و دابەزینی لە مەدینە لە مەحەلەی قوبا، وەکوو مەحمووپاشا تاقیقی کردووە لە دووهەم ڕۆژی مانگی مەولوود، ڕێکەوتی ٢٠ سبتامبری ساڵی ٦٢٢ میلادیدا بووە، جا ئەمە بووە بە تاریخێکی تازە بۆ ئیسلام. «نورالیقین»ص٧٩.

دوای تێپەڕ بوونی ١٣ ساڵ لە هیجرەت لە خەلافەتی حەزرەتی عومەرا موسوڵمانان گەرەکیان بوو تاریخی تازە و جیاواز دابنێن بۆ ئیسلام، بە پرس و ڕای حەزرەتی عومەرڕ ئەم هیجرەتیانە کرد بە تەئریخی ئیسلامی.

وە لەبەر ئەوە کە ئەووەڵی ساڵی قەمەری مانگی موحەڕڕەم بوو دوو مانگ و چەن ڕۆژ تاریخی هیجریان هاتیە بەرۆ و بوو بە ئەووەڵی مانگی موحەڕڕەم با ئەو دوو ساڵە ناجۆر نەبن لەگەڵ یەکا، ئەگەر بازێ لەم نووسراوە ناجۆری هەیە لەگەڵ ئەوانەی کە ئەیزانن قەی‌ناکا، چوون تاریخ هەر ناجۆری هەیە.

حەزرەتی نووح ١٠٤٠ ساڵ عومری بووە،لە چل ساڵیا بووە بە پێغەمبەر بۆسەر قەومەکەی. بە گوێرەی ئایەت ٩٥٠ ساڵ لەناو قەومەکەیا بوو و تەبلیغی کرد و ٥٠ ساڵ دوای ئەوان ژیاوە. عومری درێژ بووە بۆیە بە ڕەحەتی و بێ پەلە کردن فریای هەموو شتێ کەوتووە.

٥٥٥ ساڵ خەریکی ڕاگەیاندنی دین بووە بە قەومەکەی،چەن نەفەرێکی کەم ئیماتیان هانی نزیکەی هەشت کەس. لەگەڵ ئەوەدا زۆر ئازاریان ئەدا تا بێ‌هۆش ئەکەوت، کە ئەهاتۆ سەر هۆش ئەپاڕایەوە و ئەیوت: خوایا لە گوناهی ئەم قەومە خۆش ببە کە نەزانن.

بۆ نموونەی ئازاردانی: پیاوێکی پیری عاسا بەدەس کوڕێکی لەلابوو وتی بە کوڕەکەی: ئەم پیرە درۆزنە نەتخلەتێنێ و ئیمانی پێ نەهێنی، ئەمجار کوڕەکە بە

عەساکەی باوکی دەسی کرد بە لێدانی حەزرەتی نووح تا بێهۆش کەوت. کە هاتۆ سەر خۆی دووبارە دەسی کردۆ بە راگەیاندنی دین.

وە بۆ بەربەرەکانێی نووح زۆر وەخت کافرەکان بە یەکتریان ئەوت: بە درۆی ئەو پیرە دەسبەرداری بتەکانتان ئەبن و دەسبەرداری عیبادەتی ئەم پێنج بتە ئەبن: ١. ود ٢. سواع ٣. یغوث ٤. یعوق ٥. نسر. کە ئەم پێنجە ناوی پێنج پیاو سالح و چاک بوون و لە بەینی حەزرەتی ئادەم و نووحا _سەلامی خوایان لەسەر، فەوتیان کردبوو، دوای ئەوە بۆ بەرەکەت پەیکەری ئەوانیان دروست کرد کە بۆ بیرەوەری رێبازی ئەوان هەمیشە و دایم لەلایان بێ. دوایی بە تەحریکی شەیتان کردنیان بە بت و عیبادەتیان بۆ ئەکردن.

دوای ٥٥٥ ساڵ راگەیاندنی دین، خوا فەرمووی بە نووح: ئیتر کەسی‌تر ئیمان ناهێنن و تەمایەر کەس مەبە. جا حەزرەتی نووح دۆعای شەڕی لە کافرەکان کرد و وتی: خوایا کەسیان لێ مەهێڵەرۆ لەسەر ئەرزا، ئەگەر بمێننۆ لە داهاتوودا عەبدە ساڵحەکانی تۆ گومرا ئەکەن مناڵێکیان نابێ مەگەر بەدکار و کافر نەبێ. دۆعای خێری کرد بۆ ئیماندارەکان و وتی: خوایا خۆش بە لە من و باوک و دایکم و لە کەسێ کە بە ئیمانۆ هاتبێتە ناو ئەم ماڵی منە و خۆش بە لە هەموو ئیمانداری پیاوو ژن تا قیامەت و هیچ زیاد مەکە لەبۆ ئەو زاڵمانە، خەسار و هیلاک ئەبێ.

جا خوای گەورە بۆ ئەجاتی ئیماندارەکان و خنکاندنی کافرەکان فەرمووی بە نووح: کەشتییەکی گەورە بە ئەمر و چاودێری ئێمە دروس بکە. ئەمجار حەزرەتی نووح بێشەیێ داری ساجی دانا کە زۆر راس و خاس بوو بۆ ئەجاڕی، دارە ساجەکە بە سێ، چل ساڵ پیر بوو بۆ دارتاشی ئامادە بوو، ئەسبابی ئەجاری بۆ ئامادە کرد و دارەکانی بڕی و بە ٣٠ ساڵ بە ئەمر و چاودێری خوا کەشتییەکەی دروس کرد کە ٣٠٠ میتر درێژ بوو و ٥٠ میتر پان و ٣٠ میتریش بەرزی بوو، کەشتییەکەی کرد بە سێ نهۆم، نهۆمی خوارووی بۆ وەحشی و دوڕندە و مار و ئەو گیاندارانە کە بە سەر سکا ئەڕۆن، نهۆمی ناوەڕاست بۆ چوارپێ و مەڕ و بزن و

وشتر و گا، وە خۆی و ئەوانە کە ئیمانیان هێنابوو لە مەرتەبەی سێهەما بوون لەگەڵ زەخیرە و خواردن و خۆراک و تفاقێکا کە پێیان بوو، درگای کەشتییەکە لەلای پانییۆ بوو و لەو وەختی درووس کردنی کەشتییەکەدا هەروەخت کافرەکان بەلایا ئەڕۆین گەمەیان پێ ئەکرد و پێی پێ ئەکەنین و ئەیانوت: پێغەمبەر بووە بە نەجار! چوون بەلایانۆ مەحاڵ بوو کە لەو وشکییا ئاو ئەونە زۆر بێ کەشتی بەسەریا بگەڕێ. جا نووح ئەیفەرموو: ڕۆژی ئەبێ کە منیش بە ئێوە گەمە ئەکەم وەک ئێوە ئیسە گەمەم پێ ئەکەن.

بە تەمای ڕۆژی نەجات بوو، کە کەشتییەکە لەسەر شێوەی سینەی تەیرێ وەکوو سۆنە تەواو بوو قیرکاری هەردوو دیوەکەی کرد و خوای گەورە دەستووری دا بە ئاسمان ٤٠ شەو و ڕۆژ باران ببارێنێ و دەسووری دا بە زەوی ٤٠ شەو و ڕۆژ ئاوەکەی هەڵقوڵێنێ، وە نیشانەی ئەم تووفانی نووحە ئەوەبوو کە لە تەنوورەوە ئاوی بێتە سەر کە بەعادەت تەنوور جێگەی ئاورە نەک ئاو، وە ئەو تەنوورە لە بەرد دروست کرابوو لە ئادەم و حەوواوە جێ‌مابوو.

کە ئاوەکە فوارەی کرد و کەشتییەکە ئامادە بوو خوای گەورە فەرمووی سوار کەشتی بێن کە بە ناوی خوا ئەکەوێتە ڕێ و بە ناوی خوا ئەوێستێ، بەم ناوی خوا بوو کە نووح کەشتییەکەی ئەخستە ڕێ و ئەیشی وێسان.

وە خوا دەسووری‌دا کە لە هەموو جۆرە گیان‌لەبەرێ نێر و مێێ بخاتە ناو کەشتییەکەی با ئەتەوەیان نەفەوتێ. بە ئەمری خوا دەسی ئەبرد بۆ هەر جۆرە گیانداری، نێرێ ئەکەوتە بەردەسی ڕاسی و مێچکەیێ ئەکەوتە بەر دەسی چەپی، هەموویانی خستە ناو کەشتییەکە و خۆی خێزانی و ئیماندارەکان سوار بوون مەگەر ئەوانە نەبێ کە زووتر بە کافری نووسرابوون و لەگەڵ کافرەکانا بوون، وەکوو عایلەی خێزانی و کەنعانی کوڕی.

ئەوانە کە ئیمانیان هێنابوو هەشتا کەس بوون، چل ژن و چل پیاو، وە ئەم هەشت کەسە لەوان بوون: نووح و یەکێ لە ژنەکانی، سێ کوڕی بە ناوەکانی سام و حام و یافث و سێ ژنەکانیان. وە لەم شەش کەسە دوای تووفانەکە بەشەر

پەرەی سەندۆ و زۆر بوون و لە خاکی کوردستانا بوو کەشتییەکە نیشتۆ و بوو بە بێشکەی دووەم بۆ نەتەوەی بەشەر.

کە سواری کەشتییەکە بوون، رەحم زۆری هانی بۆ نووح و بانگی کرد لە کەنعانی کوڕی کە بێ سواری کەشتییەکە ببە لەگەڵ ئێمە و لە کافرەکان دوور کەوەرەوە با نەخنکی، وتی: لێم گەڕێ، نەڕۆمە سەر کێوێ بەرز تا لە ناو بمپارێزێ! نووح فەرمووی: لە ئیمڕۆدا پارێزگاری نیە لە ئەمری خوا مەگەر کەسێ کە خوا رەحمی پێ کردبێ.

ئەگێڕنۆ ژنێ تەنیا مانگایێکی بوو بۆ وەسیلەی ژیانی خۆی، لە وەختی دروست کردنی کەشتییەکەدا ئەیوت بە نووح: منت لەبیر نەچێ با نەخنکێم، لەو وەختا لەبیری چوو، دوای ئەوەکە چاویان کەوتۆ بەیەک ژنەکە وتی: چی بوو، تووفانەکە نەهات؟ نووح وتی: هەر زوو هات و تەواو بووا تۆم لەبیر چوو، ژنەکە وتی: بەڵام لەبیر خوا نەچووم! لە دەوری منا ئاو نەبوو، رۆژێ مانگاکەم هاتوو کەمێ سەر پشتی تەڕ بوو.

جا نووح هەر هاواری ئەکرد لە کەنعانی کوڕی کە بێ‌سوار بێ، تا شەپۆل ئاوەکە وەکوو کێو کەوتە بەینیان و غەرق بوو و خنکا. جا نووح وەکوو گلەیی پاڕلوۆ لە خوا و وتی: تۆ وەعدەت بە من دا کە خێزانەکەم نەجات بدەی،کەچی کەنعانی کوڕم خنکا؟ خوا فەرمووی: کەنعان خێزانی تۆ نەبوو و ئیمانی بە تۆ نەبوو و بەدڕەفتار بوو و بە دڵ و بە رەفتار لەگەڵ کافرەکانا بوو، بۆی مەپاڕێرۆ بێ فایدەیە.

جا بۆیە شێخی سەعدی لە گولستانا فەرموویەتی:

پسر نوح با بدان بنشست

خاندان نبوتش گم شد

سگ اصحاب کهف روزی چند

پی نیکان گرفت و مردم شد

که نووح سواری کەشتییەکە بوو بە ئەمری خوا وتی: خوایا لە جیگایەکی موبارەکا دامبەزێنە، خوا دۆعاکەی قەبووڵ کرد و لە خاکی کوردستانا لە مووسڵ کەشتییەکەی نیشاندەوە و دابەزان و بوو بە بەرەکەتی نەبڕاوە.

مەرقەدی دوو پێغەمبەر وا لە مووسڵ: ١. حەزرەتی شیث کە خاوەنی ٥٠ دانە پەڕەیە، کتێبێکی خوایە و بۆی نێرراوەتە خوارەوە. ٢. حەزرەتی یۆنس کەشێخی سەعدی لەبارەیۆ ئەفەرمێ:

قرص خورشیـــد در سیـــاهی شد

یـــونس انـــدر دهـان ماهی شد

وە باسی یۆنس بۆ ئێمە لێرا ناکرێ. کە نووح وتی بێن با سوار بین بە کۆمەکی ناوی خوا و ئەم زیکرە بوو بە فەرمانی و بەم زیکرە ئەکەوتە رێ و ئەوێسا.

ئەم کەشتییە لە کووفە دروس بوو کە لە زەمانی ئەسحابەکانا ئەو جێگەیانە کردبوو بە مزگەوت، کە لە کووفە سوار بوون دەهەمی مانگی رەجەب بوو تا دەهەمی مانگی موحەڕڕەم رۆژی عاشوورا،شەش مانگی پێچوو، لە ماوەی ئەو شەش مانگا ئەو کەشتییە تەواوی دونیا گەڕا بەسەر ئاوەکەدا، جا کە ماوەکە تەواو بوو خوای گەورە دەسووری دا بە زەوی کە ئاوەکەت هەڵمژەرۆ و ئەی ئاسمان ئیتر باران مەبارێنە، کە زەوی وشکۆ بوو کەشتییەکە لەسەر کێوی «جوودی» کە وا لە جەزیرە بەحری مووسڵا، نیشتۆ و کەشتی نشینەکان وتیان: ئیمڕۆ دووری لە رەحمی خوا بۆ زاڵمان بوو کە خنکان. بۆ بڕوا بەم وتەیە ٥٠ ساڵ بەر لە ئیمڕۆ کە ساڵی ١٣٨٨ شەمسییە، لە ژێر خاکی کێوی جوودییا بازێ لە تەختەی ئەو کەشتییە دۆزرایەوە.

جا کە گەشتی شەش مانگەی کەشتییەکە تەواو بوو خوای گەورە فەرمووی: ئەی نووح دابەزە بە خۆشی و باشی و سەلامەتی و بەرەکەتی زۆرۆ، لەسەر خۆت و ئەوانەی کە وان لەگەڵتا. جا هەموو ئیمانداری بەر ئەم دۆعای نووحە ئەکەوێ کە لە ئیمانداریا وان لەگەڵ نووحا.

ئەو رۆژە حەزرەتی نووح سەلامی‌لەسەر کە لە کەشتییەکە دابەزی رۆژی عاشوورا بوو، خۆی بەڕۆژوو بوو بۆ شوکری خوا کە نەجاتی بوو لە تووفانەکە، وە دەسووری دا بە تەواوی ئەو ئیماندارانە کە لەگەڵی بوون بەڕۆژوو بن بۆ شوکرانەی خوا. لەویا دێیەکیان دروس کرد لە نزیکی کێوی جوودی و ناویان نا «سوق ثمانین» ئەوە ئەووەڵ دێ بوو کە دروس کرا دوای توفانی نووح، وە ئەو بەرەکەتە خێرێکی نەبڕاوە بوو کە ئەولاد و پەیڕەوانی زۆر بوون و ئەو هەموو پێغەمبەر و پێشەوا و ساڵح و پیاوچاکانە دوای تووفانەکە لە نەتەوەی نووحن. وە ئەو هەموو مزگەوتی ئیسلام و حوجرە و فەقێ و مەلا و موجتەهید و موسوڵمانە باشانە، هەموو لە ئوممەتی پێغەمبەری ئاخر زەمانﷺ لە زۆری ئەو بەرەکەتە پەیا بوون.

ئەم بەسەرهاتی تووفانی نووحە لە سوورەتی «هوود» لەئایەتی ٣٩ تا ٥٢دا باسی ئەکا و من کە بەم شێوە نووسیومە لە تەفسیری «خازن» وەرم گرتووە.

## حەزرەتی ئیبراهیم

حەزرەتی ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر، دۆسی خوا و پێغەمبەری خوا بوو، کوڕی تارۆخ بووە، کە نازەریشیان پێ وتووە. ئیبراهیم برایەکی بووە بەناو هاران، کە باوکی حەزرەتی لووتی پێغەمبەر بووە. حەزرەتی ئیبراهیم لە سارا خاتوونی حەرەمی، حەزرەتی ئیسحاقی بووە و ئەویش پێغەمبەری خوا بووە، وە لە هاجەرە خاتوونیش حەزرەتی ئیسماعیلی بووە و ئەویش پێغەمبەری خوا بووە و ئەم لە عومرا لە ئیسحاق گەورەتر بووە، وە حەزرەتی ئیسحاق کوڕێکی بووە کە بە لەقەب پێیان وتووە یەعقووب، لەبەر زۆری نەتەوەی ناوی ئیسرائیل بووە بە مانا «عبدالله»، وە ئەو هەموو تایفەی بەنی‌ئیسرائیلە لە نەتەوەی ئەون، چل هەزار (٤٠,٠٠٠) پێغەمبەریان بووە.

حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ نەمروودا کە داوای خوایی ئەکرد زۆر دەرگیر بوو، لە تەفسیری «خازن»دا هاتووە کە نەمروود کوڕی کەنعانی کوڕی سەنجاریبی کوڕی نەمروودی ئەووەڵ بووە، ئەمیش کوڕی کووش کوڕی حام کوڕی حەزرەتی نووح

بووه. جا که نەمروود به دەلیل و قسه دەرەقەت حەزرەتی ئیبراهیم نەئەهات، وتیان: به ناور بیسووتێنین، به قەولی ئەڵێن: ئەووەڵ کەسێ که وتی بیسووتێنین نەمروود خۆی بووه، به قەولی ئەڵێن کوردێ بووه بەناو «هەبرین»، له جەزای ئەوا به ئەمری خوا ئەرز قووتی دا و تا ئێستاش هەر ئەچێته خوارەوه و تا ڕۆژی قیامەت ڕۆچوونی بەردەوامه. بۆ ئەم بەسەرهاتی حەزرەتی ئیبراهیمه تەماشای تەفسیری خازن لاپەڕەی ٢٤٦ی سوورەتی «انبیا» ئایەتی ٦٨ تا ٧٤ بکه.

ئیبراهیمیان له ماڵێکا حەبس کرد که پێیان ئەوت «کوسی»، به ژن و پیاوۆ تێکۆشین و له ماوەی یەک مانگدا له سەختەدار و له هەموو جۆره دار و سووتەمەنییەک کۆگایەکی گەورەیان جەم کردۆ و ئەمەیانه به خێرێکی گەوره ئەزانی و وەک سەدەقه داریان کۆ ئەکردۆ. که به مەیلی خۆیان داریان جەم کرد، ئاوریان تێبەردا و له هەموو لایەکۆ باڵدار بەسەریا بڕوایه ئەسووتا، تا حەوت ڕۆژ ئاورەکه هەروا بوو، که گەرەکیان بوو به دەس و پا بەسیاوی حەزرەتی ئیبراهیم بخەنه ناو ئاورەکه، لەبەر گەرمی نەیان‌ئەتوانی بچنه بەرۆ، شەیتان هات تەگبیرێکی بۆ کردن و فێری دروس کردنی مەنجەنیقی کردن، به دەسووری ئەو مەنجەنیقیان دروس کرد و ئیبراهیمیان لەسەر دانا و لەسەر بانێ بەرزۆ به مەنجەنیقەکه فڕەیان دا بۆناو ئاگرەکه.

ئەرز و ئاسمان و مەلائیکه و هەرچی له ئەرز و ئاسماندا بوو بەشەر و جنۆکه نەبێ هەموو هاوارایان لێبەرزۆ بوو بۆلای خوا بۆ نەجاتی حەزرەتی ئیبراهیم. جا خوا فەرمووی: من دۆسێکم نیه ئیبراهیم نەبێ و ئەویش خوایەکی نیه من نەبێ، وه هاوار له کەسیتر ناکامن نەبێ ، وازم لێبێنن بزانێ چۆن نەجاتی ئەدەم.

که خستیانه ناو ئاورەکه، ئازا جوبرەئیل هات بەدەمیۆ و وتی: ئایا کارێکت هەیه بۆتی ئەنجام بدەم؟ وتی: به تۆ هیچ کارێکم نیه. جوبرەئیل وتی: با بۆت بپاڕێمۆ له خوا. ئیبراهیم و تی: خوا خۆی ئاگای لێمه و ئەمەیشم بەسه. جا خوا فەرمووی به ئاورەکه: «ساردەوه به به جۆرێ که سەرماکەت زەرەری بۆ ئیبراهیم

نەبێ». وە حەزرەتی ئیبراهیم لە ناو ئاورەکەدا ئەمە زیکری بوو: «حسبی الله و نعم الوکیل» یانێ: خوام بەسە بۆ هەموو کارێکم و پەروەردگارم وەکیلێکی چاکە.

ئیتر پەتەکە سووتا کە بەسرابوو بە دەس و پایۆوە کە کەوتە ناو ئاورەکە مەلائیکە هەردوو باڵیان گرت و لەسەر ئەرزەکەدا دایاننا، کە وەکوو باخچەی بەهەشت وابووە دەسێ لیباسی بەهەشتییان بۆ هانی و کردیە بەری و فەرشی بەهەشتیان بۆ هانی و لەسەری دانیشت، وە مەلائیکە دەورەیان دا تا بێتاقەت نەبێ، بۆیە فەرموویە: لە ژیانما لەو حەوت رۆژە خۆشتر نەبووە کە لەناو ئەو ئاورا بووم. جوبرەئیل وتی: ئەی ئیبراهیم خوا ئەفەرموێ: ئایا ئازانی کە ئاور زەرەری بۆ دۆسی من نیە؟.

ئەمروود لە کۆشکەکەیۆ بۆی روانی چاوی کەوت بە ئیبراهیم کە دانیشتووە و لە جێیەکی خۆشا وەک باخچەی پڕ لە ئەرگس و گوڵ و مەلائیکە بە دەوریا دانیشتوون و دەوریان لێ داوە و بە دەوریانا ئاورەکە هەر ئەگڕا. ئەمروود وتی: خواێ گەورەت هەیە ئەی ئیبراهیم، کە لە قودرەتی ئەوو ئاورەکە ئەیسووتانی. دووبارە وتی: ئەی ئیبراهیم ئەتوانی لە ئاورەکە بێتە دەرۆ و ئەتسووتێنێ؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی بێرە دەرۆ، هاتەدەرۆ و رۆیی بۆلای ئەمروود و ئەمروود وتی: ئەو هەموو قودرەت و عیززەتی خوامە چاو پێکەوت کە چۆن تۆی پاراست لە سووتانێ کە لەسەر عیبادەت ئەو ئەمانسووتانی، ئەمەوێ ٤٠٠٠ سەر گا سەر ببڕم بۆ خوا. ئیبراهیم وتی: تا لەسەر ئەو دینە ناحەقە بی خوا خێرت لێقبووڵ ناکا، بێرە سەر ئەم دینە حەقە جا سەریان ببڕە با خوا لێتی قبووڵ بکات. وتی: ناتوانم بێمە سەر دینی تۆ، چوون موڵکەکەم لەدەس دەرئەچێ، ئاخری هەر گاکانی سەر بڕی.

دوای ئەم بەسەرهاتە خوای گەورە ئەجاتی ئیبراهیم و لووتی دا و کۆچیان کرد بۆ ئەرزی بەرەکەتدار کە شامە و بەرەکەتەکەی ئەو هەموو پێغەمبەرانەیە کە وان لەوێ.

لە کتێبی «مدارک»دا نووسراوە: لە عێراقۆ کۆچی کردووە بۆ شام.

(با بزانین) خوالێخۆشبوو مامۆسا مەلا باقری بالک (باوکم) ئەیفەرموو: ئەو گلگەی ناوری نەمروودە و مەنجەنیقەکەی لە کەشەدەرەدا بوو کە خاکی دێی «کێلو» و «مەسۆیە» (کە دوو دێن) لە بەرابەر پێنجوێن، وە مەرەزەجارێ لەویا هەیە بەناو برایم ئاوا. جا کەوابێ ئەو «کۆسی»یە کە حەزرەتی ئیبراهیمیان تیا حەبس کردبوو بۆ سووتانن ئەبێ کۆسی «ئەچێ» بێ کە ئیسە قەبرستانە و زوو دێ بووە و لە «کێلوو» نزیکە. خوای گەورە ئەفەرموێ: نەمروود و قەومەکەی گەرەکیان بوو فێڵ کەن لە ئیبراهیم، ئێمە لە جەزای ئەوا زەرەرمەندمان کردن، خوا لەشکری مێشوولەی نارده سەریان، گۆشتەکەیان ئەخواردن و خوێنەکەیان ئەمژین تا ئەمردن، وە مێشوولەیێ چووە ناو دەماخی نەمروود تا نەمرد وازی لێ نەهانی.

لەم باسی حەزرەتی ئیبراهیما بۆمان مەعلووم بووە کە حەزرەتی ئیبراهیم کورد بووە و لە خاکی کوردا پەروەردە بووە و ژیاوە و کەماڵی پەیا کردووە بۆ راگەیاندنی دینەکەی کۆچی کردووە بۆ شام.

ئیبراهیم عەجەمییە و عەرەبی نیە، بە مانا «اب رحیم» یاتێ باوکێکی بەبەزەیی، کوڕی تارۆخ بووە و پێیان وتووە ئازەر، تارۆخ کوڕی ناخور بووە و ئەویش کوڕی شاروعی کوڕی ئەرغوی کوڕی فالَغ، کوڕی عابری کوڕی شالخی کوڕی ئەرفەخشەزی کوڕی سامی کوڕی نووح بووە.

ئیبراهیم لە سووس لە دایک بووە کە خاکی ئەهوازە، بازێ ئەڵێن لە بابل لەدایک بووە و بازێکیش ئەڵێن لە کوسی لەدایک بووە کە دێیەکە لە کووفە، بازێکیش ئەڵێن لە بوحرا لەدایک بووە و باوکی بردوویە بۆ بابل کە موڵکی نەمروودی زالم بووە.

بە هەرحاڵ، حەزرەتی ئیبراهیم هاجەرە خاتوونی حەرەمی لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیا کە مناڵێکی شیرەخۆر بوو بردنی بۆ مەککە و لای ماڵی بەیتا کە لەو کاتا ماڵ نەبوو لە بەرزاییەک لای بیری زەمزەما کە لەو وەختا بیری زەمزەم نەبوو، دایانی نا و بازێ خورما کە لە هەوانەیێکا بوو و بازێ ئاو کە لە کونەیەکی چکۆلەدا بوو

بۆیانی داناو، لەو وەختا کە لەو جێیە کەس نەبوو و ئاوەدانی نەبوو و خۆراک و ئاوی تیا نەبوو ئیبراهیم بەجێیانی هێشت و گەڕاوە و هاجەرە خاتوون کەوتە شوێنی و وتی: ئیبراهیم بۆ کوێ ئەڕۆی و ئێمە لەم شیوە چۆڵ و هۆڵا بەجێ ئێلی کە کەسی لێ‌نیە و هیچی تیا نیە؟، چەن جار ئەمیە تکرار کردۆ و ئیبراهیم لای نەکردۆ تا بەزەیی نەیتۆ پیایانا و ئەمرەکەی خوا جێبەجێ بکا و بێ ئەمری خوا نەکا. هاجەرە وتی: خوا ئەمری پێ کردووی لەگرا جێمان بێلی؟ ئیبراهیم وتی: بەلێ. هاجەرە خاتوون وتی: ئیتر خوامان بەسە و خوا پەکمان ناخا.

کە لە چاو ئەوان ون بوو لە «ثنیةالوداع»دا رووی کردە بەیت و دەسی بەرز کردۆ و ئەم دۆعایە خوێند: ئەی پەروەردگاری ئێمە من دامناوە بازێ لە ئەولادەکانم لە شیوێکی بێ زەراعەت و چۆڵا لای ماڵەکەی خۆتا کە زۆر بە حورمەتە و هەموو کەسێ سڵی لێ ئەکا. بۆ ئەوە دامناون کە ئەو جێگە ئاوەدان بکەنۆ و نوێژ و عیبادەتی تیا بەرپا بکەن. دڵی بازێ مایل بکە بەلایانۆ کە زوو بڕۆن بۆلایان و رزقی زۆریان بۆ بنێرە لە هەموو سەمەرێ.

لەوساوۆ بەو دۆعای ئیبراهیمە مەککە بەو هەموو رەق و تەقی و وشکییە لە هەموو جۆرە سەمەر و نیعمەتێکی بە کۆڵ و بە بار بۆ رۆییوە و بۆیشی ئەڕوا. بۆ ئەوە خوا ئەو نیعمەتە ئەنێرێ کە شوکری بکەن. جا بە دۆعاکەی ئیبراهیم ئەو جێگایە بوو بەجێی عیبادەت و زیکر و حەج و تەقوا، ئیسە و تا قیامەت هەر وا ئەبێ.

جا دایکی ئیسماعیل شیری ئەدا بە ئیسماعیل و لە ئاوەکەیشیان ئەخوارد، کە ئاوەکە تەواو بوو تینوویەتی زۆری بۆ هێنان و هاجەرە شیری تیا نەما و لە حەیبەتا کوڕەکە تلاوتلێی ئەکرد بە جۆرێ کە دایکی دڵی بڕوای نەئەدا بڕوانێ بۆی. کە تەپۆڵکەی سەفای لێ نزیک بوو رۆیە سەری و روانی بزانێ کەسێکی بەرچاو ناکەوێ یان ئاوی دەس ناکەوێ، بەڵام کەسی نەدی، هاتە خوارۆ کە گەییە ئەو شیوە کە وا لەبەین سەفا و مەروەدا کراسەکەی هەڵ کرد و روو بە مەروە رای کرد وەکوو کەسێ کە پەلەی کارێکی بێ، بازێ روانی و کەسی بەرچاو نەکەوت و

گەڕاوۆ. تا حەوت جار بەو جۆرە هاتووچۆی کرد لەبەین سەفا و مەروەدا و کەسی نەدی و لە بڕێ جێگەدا لای نەکردۆ بۆلای ئیسماعیل و هەواڵێکی نەزانی. ئیسەیش حاجییەکان خۆزگەم بە خۆیان بە سوننەتی هاجەرە خاتوون ئەو حەوت هاتووچووە ئەکەن لە بەینی سەفا و مەروەدا و یەکێکە لە ئەرکانەکانی حەج بۆ حاجی و واجبە بیکا.

لە کەڕتی ئاخرا کە گەییە مەروە دەنگێکی بیست و خۆی بە خۆیی وت: بێدەنگ بە! بە باشی گوێی گرت دەنگێ‌تر کەوتە گوێی و وتی: دەنگت کەوتە گوێم، خۆزگا پەنا بوایی بۆ من، روانی ئەو دەنگە دەنگی مەلائیکەیەکە وا لەلای جێی بیری زەمزەما و باڵی دا بە ئەرزا و ئاوی زەمزەم هاتە سەر، هاجەرە خاتوون گۆمەڵاتی بۆ دروس کرد و ئیشارەتی ئەکرد بۆ ئاوەکە کە ئاوا بێ، ئاوی کردە کولە لۆجکەکەی ئاوەکە هەر هەڵئەقوڵی و بە فشار ئەهاتە دەرۆ بەباشی چاری نەئەکرد تا هاجەرە پێی فەرموو: «زەمزەم» یانێ ئارام بە و لەسەرخۆ و راوەستە، جا ئەگەر هاجەرە بەرگیری لێ‌نەکردایە زۆر ئەبوو و ئەو جێگەیە تێراو ئەکرد و ئەو جێگە ئەبوو بە کانی رەوان بەڵام ئیستە لەبەر دەسووری هاجەرە وێساوە و بەڵام بەردەوامە و کەم و زیاد ناکا. ئەمجار خۆی ئاوی خواردۆ و دەرخواردی ئیسماعیلیشی دا.

لەبارەی زەمزەمۆ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاوی زەمزەم بە هەر نیازێ بیخۆیتۆ بۆت جێبەجێ ئەبێ. وە دوبارە فەرموویەتی: ئاوی زەمزەم تێر و تێراوت ئەکا.

لە کتێبی «المنجد»دا هاتووە کە «زەمزەم» بیرێکە لە مەککە و وا لە نزیکی کابەدا و لە حەرەمی شەریفا، کە حەزرەتی ئیسماعیل و هاجەرە خاتوونی دایکی ئەو بیریانە لێ داوە، دوای ئەوە ئەو بیرە چەن وەختێ گوم بووە، جا «عبدالمطلب» باوەگەورەی پێغەمبەر جێگەکەی پەیا کرد و دووبارە بیرەکەی هەڵکەندۆ و ئاوەکەی دۆزیۆ و ئەو ئاوە زۆر بە حورمەت بووە تەنانەت لە زەمانی خوانەناسیا تا ئیسەیشە هەروا لەناو موسوڵمانانا کە حاجی ئاویان لێ خواردووە و بردوویانە بۆ

هەموو جێین بۆ تەبەڕرک. نەزارەتی ئەو ئاوە تا ئیسە بەدەس نەتەوە و بنەماڵەی «عبدالمطلب» بووە.

جا لەبەر دڵ هاجەرە مەلائیکەکە وتی: مەترسە لەبەین ناچی و ئەم کوڕتە لەگەڵ باوکی لەگرا ماڵی خوا دروس ئەکەن و خوا هۆشی ها بە دانیشتوانی ئەم شیوۆ و خەم مەخۆ. وە چوون جێگەی کابە بەرز بوو لافاو بەسەریا نەئەڕۆیی و لای ئەدا و بەملاولایا.

هاجەرە خاتوون تەنیا هەروا لەوێ ماوۆ تا چەن نەفەرێ ڕێبوار لە ئەهلی جورهوم (جُرهُم، باوکی تایفەیەکی کونە، ئەڵێن لە یەمەنۆ هاتوون و بوون بە دوو تایفە، بائدە و عاربە عارەبەکان نیشتەجێی مەککە بوون. المنجد) لەوێوە ئەڕۆیین بۆ کاروان لە خوار جێگەی شاری مەککە دابەزین و باڵداری وەتەنییان چاوپێکەوت، وتیان ئەم باڵدارە حەتمەن وا بە دەور ئاوا و ئێمەیش بەڵەد ئەم شوێنە بین ئاوی تیا نیە، چەن نەفەرێکیان نارد و تووشی ئاوەکە بوون و هاتنۆ و دیان ئاو هەیە، ڕۆیین بۆلای ئاوەکە. دایکی ئیسماعیل لای ئاوەکە بوو وتیان ئیجازەمان ئەدەی ئێمەیش بین بۆ دەورت و لەگرا بار بخەین و بمێنینۆ؟ وتی: بەڵێ، بەڵام حەقتان بەسەر ئەم ئاوۆ نیە و ماڵی خۆمە. وتیان: باشە، جا لەویا باریان خست و ناردیان بەشوێن ماڵ و خێزانیانا و لە یەمەنۆ هاتن و لەویا دانیشتن و چەن ماڵی بەدەوریا کۆ بوونۆ و ئاوەدانۆ بوو.

ئیسماعیل گەورە بوو لەوانۆ فێری زوانی عەرەبی بوو و ڕەفێقی لەگەڵ داخستن، زۆر کوڕێکی شۆخ‌وشەنگ و عەجایب بوو بەلایانۆ، کە پێگەیی لە خۆیان کچێکیان بۆ مارە کرد و ژنیان پێدا.

دایکی ئیسماعیل فەوتی کرد و ئیبراهیم هاتۆ بۆلایان کە سەریان لێ بدا و بزانێ چۆنن، ئیسماعیل لە ماڵۆ نەبوو، لە ژنەکەی پرسی لە کوێیە؟ وتی: ڕۆییوەسە دەرۆ شتێکمان بۆ پەیا بکا، ئیبراهیم وتی: ژیانتان چۆنە و چۆن ئەژین؟ وتی: هاین لە سەخت‌ترین و ناخۆش‌ترین ژیانا. سکاڵای زۆری کرد، ئیبراهیم

وتی: کە شووەکەت هاتۆ لە منۆ سەلامی پێ بگەیێنە و پێی بڵێ ژێر گێجەنەی دەرگاکەی بگۆڕێ.

کە ئیسماعیل هاتۆ زانی کەسێ هاتووە بۆماڵیان، وتی: کێ هاتووە بۆ ماڵمان؟ ژنەکەی وتی: پیاوێکی پیری ئاوا و ئاوا هات بۆ ماڵمان و پرسیاری لە ژیانی ئێمە ئەکرد و منیش وتم: هاین لە ئەوپەڕ سەختی ژیانا و سکاڵای زۆرم کرد. ئیسماعیل وتی: ئەو پیرە راسپاردەی پێ نەبوو؟ وتی: بەڵێ، سەلامی بۆ ناردی و وتی: ژێر دەرگاکەی بگۆڕێ. ئەویش وتی: ئەوە باوکم بووە و ئەمری کردووە بە من کە لە تۆ جیا ببمۆ، کەوابوو بڕۆرۆ بۆ ماڵ باوکت، ئیتر تەڵاقی دا و ژنێ‌تری لێ‌خواستێ.

تا بەینێ زۆری پێچوو و ئیبراهیم نەهاتۆ بۆلایان و دوای ئەوە هاتۆ بۆلایان و دووبارە ئیسماعیل لە ماڵ نەبوو، چووە ژوورۆ بۆلای ژنەکەی و پرسیاری بۆ کرد، ژنەکەی وتی: رۆییوە بە شوێن رزقا بۆ ئێمە، لیی پرسی: چۆنن و چۆن ئەژین؟ وتی: شوکر بۆ خوا واین لە خێر و خۆشیا و شوکری خوای زۆر بەجێ هێنا، پرسی: خۆراکتان چییە؟ وتی: گۆشت، وتی: خواردنەوەتان چییە؟ وتی: ئاوە، ئیبراهیم دۆعای کرد و وتی: خوایا بەرەکەت بخەرە ئاویان. ئیسەیش لە بەرەکەتی ئەو دۆعایە ئەوە کە زۆر بێ لە مەککە گۆشت و ئاوە.

ئیبراهیم وتی: شووەکەت هاتۆ سەلامی منی پێ بگەیێنە و پێی بڵێ باش هۆشی بە ژێر گێجەنەی دەرگاکەوە بێ. کە ئیسماعیل هاتۆ و تی: کەسێ هاتووە بۆ ماڵمان؟ وتی: پیاوێکی پیری خۆش هەیئەت و جوان‌خاس هاتبوو بۆ ماڵمان و پرسیاری تۆی کرد و خەبەرم بۆ گێڕاوۆ و پرسی: ژیانتان چۆنە؟ وتم: شوکر زۆر باشین. وتی: راسپاردەیێکی پێ نەبوو بۆ من؟ وتی: بەڵێ، سەلامی لێ ئەکردی و ئەیوت: هۆشی بە ژێر دەرگاکەیۆ بێ و مەحکەم ڕای‌گرێ. ئیسماعیل وتی: ئەوە باوکم بووە و تۆیش ژێر درگاکەی و ئەمانەتی سپاردووی بە من .حەزرەتی ئیبراهیم تا ماوەیێ زۆر نەهاتۆ و دوای ئەو ماوە هاتۆ بۆ دیەنیان و لەو وەختا ئیسماعیل لە بن دارێکا بوو لای زەمزەم، کە چاوی بە باوکی کەوت هەڵسا و شاد

بوونۆ به یەک و دەسەمل یەکتر بوون. لە دوای ئەوە ئیبراهیم وتی: ئەی ئیسماعیل خوا ئەمرێکی کردووە بە من تۆیش یارمەتیم ئەدەی؟ وتی: هەرچی بفەرمووی حازرم و بەگوێت ئەکەم و کۆمەکیشت ئەبم. ئیبراهیم وتی: خوای گەورە دەسووری داوە لەو بەرزییا دیوێ دروس بکەم.

ئیبن‌وعەبباس ئەفەرمێ: بۆ دیاری کردنی ئەو جێگەی ماڵی خوا، خوای تەعالا پەڵە هەورێکی نارد بە ئەندازەی کابە بۆ سەر ئیبراهیم و لەگەڵیا ئەڕۆیی تا ئەو جێگەی کابە، لەویا وێسا،کە بەو ئەندازە کابە دروس‌بکا، لە جێگەکەی زوویا.

ئەووەڵ ماڵێ کە لەسەر ئەرزا بینا کراوە ئەو دیوەیە کە ناوی کەعبەیە و خوای گەورە لە مەککە بینای ناوە، وە زیارەتگا و جێی تەوافی مەلائیکەتان بوو کە وا لە حەن «بیت‌المعمور»ا و ئەویش وا لە ئاسماندا، کە ئەو بەیتە لە بەین چوو بەبۆن درێژەی زەمانۆ حەزرەتی ئادەم تازەی کردۆ هەر لەو جێدا. وە چل کەڕەت لە (سەرەندیب)ۆ هاتووە بۆ حەج و زیارەت و تەوافی ئەو کابەی حاجاتە. (سوورەتی ئالی عیمران ئایەتی٩). کەوابێ حەزرەتی ئادەم باوەحاجی گشتمانە و بڕۆین بەشوێنیا.

هەروا کەعبە مابوو تا تووفانەکەی حەزرەتی نووح، جا مەلائیکە هەڵیان گرت و بردیان بۆ ئاسمان و شوێنەواری هەر مابوو تا ئیبراهیمی خەلیل بە ئەمری خوای جەلیل و میعماری جوبرەئیل و شاگردی ئیسماعیل لەسەر بیناکەی زوو کابەی دروس کردەوە بۆ ئەوە زیکر و تەقوا و عیبادەتی خوای تیا بکرێ.

حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل دوای تەواو بوونی بینای کەعبە، دوو قۆڵی پاڕانۆ لە خوا و هاواریان کرد: پەروەردگارا قەبووڵی بکە لە ئێمە کە تۆ بیسەر و دۆعا و زانای نیەتی ئێمەی، پەروەردگاری ئێمە، ئێمە کە دوو موسوڵمان یەکتاپەرستی گەردەن کەچین بۆ فەرمانی تۆ بە خالیسی، وە لە ئەولادی ئێمەیشا جەماعەتێکی موسوڵمان گەردن‌کەچ پەیا بکە، پەروەردگاری ئێمە بنێرە بۆیان، لە خۆیان پێغەمبەرێ کە بخوێنێتۆ بۆیان ئایەتەکانی قورئانی تۆ و باش فێری مەعنا

و ئەحکامی ئەو قورئان و سوننەتیانە بکا و فێری ئەویانە بکا کە چۆن حەق پەیا بکەن لە ووتار و عەمەڵا و پاکیان بکاتۆ لە کافری و بتپەرستی و باقی گوناهەکانیتر، تۆ زۆرداری بەسەر هەموو زۆردارێکا و حاڵزانی هەموو کەسی. (سوورەتی البقرة ئایەتی ٢٤ و ٢٣ و ٢٢).

جا خوای تەعالا دوای ماوەیەکی زۆر دۆعاکەی قبووڵ کرد کە پێغەمبەری ئاخرزەمانی نارد و قورئانی بۆ نارد کە ئەحکام و مەسڵحەتی هەردوو دونیای هاتیا و هیچ نوقسانییەکی نیە و خەیرە ئوممەتی کرد بە پەیڕەوێ کە گیان و ماڵی خۆیان داوە و ئەیدەن لە رێگەی دین و قورئانا کە ئەو هەموو مزگەوت و فەقێ و مەلایانە بە نازۆ بردووە بەڕێوە و تا قیامەت خوا پشتیوانی ئەکا لەم دینەوە تا ئیمانداری مابێ لەسەر ئەرزا خوا دونیا تەواو ناکا، کەوابێ ئیمان و عەمەڵی ساڵح وەسیلەی بەقای دونیایە، وە خوا بە خەیرەئوممەت قەبووڵمان بکا، ئامین.

حەزرەتی ئیسماعیل نەتەوەی زۆر بووە و لەناو ئەوانا تەنیا حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری خوا بووە و حەزرەتی موحەممەد بە نەتیجەی زەحمەتی ئەوان دانرلوە و لە ئادەمۆ تا ئیبراهیم و ئیسماعیل هەموویان جێگەیان بۆ ئەو خۆش کردووە و موزدەیان داوە بە هاتنی گوڵی گوڵان. وە کابەیش لە ئادەمۆ تا خاتەم قیبلەی هەموو ئیمانداری بووە و ئەبێ قیبلەی هەموو مردوو و زیندووی ئێمەیش بێ. لە نوێژا کەسێ روو نەکاتە قیبلە نوێژی دروست نیە، وە ئەبێ هەموو موسوڵمانێ لە قەبرا رووی کرێتە قیبلە. ئەڕۆیتە ناو قەبرستانێ ئەگەر مردووەکان روو بە قیبلە بوون، ئەوە موسوڵمانن. ئەمانە گشتی عیززەتی دینی ئیسلامە و ئێمە موسوڵمانیش ئەبێ هەمیشە پەیوەندیمان لەگەڵ مەککەدا بەردەوام بێ، کە روو ئەکەینە قیبلە بۆ نوێژ و لە هەموو تەحیاتێکا سەلام ئەکەین لە پێغەمبەر کە لەلای خۆمانا بە حازری ئەزانین. وە لە پێنج فەرزەی نوێژا نۆ تەحیات هەیە و نۆ کەڕەت سەلام ئەکەین لە پێغەمبەر.

جا با بزانین بەرەکەتی دینی ئیسلام چەنێ زۆرە، وە پێغەمبەری ئیسلام عولەمای ئوممەتی خۆی لەجێی پێغەمبەرە ئیسرائیلییەکان داناوە و ئەوان تەورات

و زەبوور و ئینجیل و دینی مووسا و عیسا و داوودیان بەخەڵک ڕاگەیاندووە، عولەمای ئوممەت ئەبێ قورئان و دینی ئیسلام پشتیوانی کەن و ڕایگەیێنن بە خەڵک، وە واجبە لەسەر ئوممەت ئەمریان بەجێ بێنن.

ئەمانە کە لەگرا نووسیومە لە تەفسیری خازن و تەفسیری مەدارک وەرم گرتووە، جا تەماشایان کەی باشتریش حاڵی ئەبی و زیاتریش ئەزانی. (سوورەتی ئالی عیمران ئایەتی/١٠٠)

ئوممەت و عولەمای ئوممەت عیشق و عەلاقەکاری وای پێ کردون کە وەکوو کەرامەت و موعجیزە وایە، بۆ نموونە «ستە زوبەیدە» کە حەرەمی هاروونەڕەشید بووە کە حاکمی بەغدا بووە و هەردووکیان ئامۆزا بوون و لە تایفەی بەنی‌ئومەییە. ستە زوبەیدە بە خەرجی خۆی ئاوی فوراتی لە بەغداوە بە جۆگە بردووە بۆ مەککە و ئەو ئاوە کۆمەکێ زۆر باش بووە بۆ دانیشتووانی مەککە و لە هەموو قۆناخێکا ئەو ئاوە دەرخستووە بۆ ڕێبواری ئەو بەینە تا مەککە مەگەر خوا خۆی جەزای باتۆ. ئیسەیش ئەو ئاوە هەر هەیە و هیچ کەس سەری لێ‌دەرناکا ئەو وەسا چۆن ئەو ئاوەیە گەیانووەتە مەککە.

وە لەگرا نموونەیێ لە زەحمەتی عولەما ئەنووسم خوایان لێ ڕازی بێ:

١. ئیمامی حەنەفی کە سەرمەزهەبی حەنەفییەکانە، چل ساڵ لەسەریەک دوای نوێژی عیشا نەخەوتووە و خەریکی زانین و فێر بوونی عیلم و عیبادەت بووە تا بەیانی و نوێژی بەیانی بەدەسنوێژی عیشاوە کردووە.

٢. حەزرەتی عبدالقادر گیلانی کە عالمی شەریعەت و تەریقەت بووە، هەروا نوێژی بەیانی بەدەسنوێژی عیشاوۆ کردووە تا چل ساڵ.

٣. ئیمامی شافیعی میوانی عالمێکی گەورە بووە کە قەرار بووە کچێکی لێ بخوازێ، هەر ئێوارە دوای نوێژی عیشا خەوت و سەری بەرز نەکردۆ تا نوێژی بەیانی. کچەکە وتی: ئەو شەونوێژ نەکا چۆن شووی پێ نەکەم، کە هەڵسا لە خەو ئازا نوێژەکەی بەیانی کرد و فەرمووی: ئیمشەو کە ڕاکشاوم بە دڵ خەریکی

راسۆ کردنی مەسایلی شەرعی بووم، تا بەیانی ١٤٠ مەسەلەی فیقهیم حەل کردووە.

٤. جا تۆ تەماشای بەسەرهاتی عولەما و ئوممەتی موحەممەدی بکەی زۆرتر ئەزانی کە لە ڕێی دینا چۆن بوون و چۆنیان کردووە. خوایان لێ ڕازی بێ، ئامین.

با ئێمەیش وا بین هەرتــاکوو مابــین
سەربەرزی دونیا و ڕۆژی عوقبا بین

×××

## بەشی دووهەم

## باسی تەق و پۆقە لە بەینی کورد و گۆڕاندا

تەق و پۆق لە بەینی کورد و گۆڕانا زۆر بووە، کورد جافێکن کە دەوار نشینن، کۆچەرین، ئەو کوردانە کە خانەنشینن گۆڕانن.

جافەکان بە حەیوانداری و بە خێڵەوزوور و خێڵەوخوار بەڕێ ئەچوون، بە زمسانا لە گەرمیان بوون و لە هاوینا هاتوون بۆ کوێستان بۆ هەوارخۆری و ئاژەڵداری.

زۆر بەدەسەڵات و زۆر زۆردار بوون، بۆیە شێخ رەزا وتوویەتی:

قەومینە مەچن ئێوە بە گژ عەشرەتی جافا
مێشوولــە ئەچێ باشە بە گژ قوللەیی قافا

مەریوانی کەم بوون، ئەڵێن پیاوی دەرزیانی کە لە کۆنە دێی مەریوان بووە، لە دەرزیانۆ لە دەشتی نێ و کانی‌سانانۆ ڕۆیوە بۆ ساوا بە شەش سەعات تا گەیونەتە ئەوێ چوار ئەفەری تووش بووە بۆیە ئاوا زەلیلی بەردەسی جاف بوون.

جاف زوڵمیان لە گۆران زۆر کردووە، بۆ نموونە:

١. گۆرانێکیان گرتووە لە گەرمای هاوینا کەرەکێکیان کردووەتە بەری و لە سێبەریا خەوتوون.

٢. ئاوی چەمی دەرەتفێیان بە جۆگە بردووە بۆ دەشتی بێلوو. ئاوی دێی پیرسەفا و کانی‌سپیکە و یەنگیجە و بەردەڕەشەیان خستووەتە سەر ئەو جۆگە بۆ

ئەوە لەو دەشتا لە هەرکوێ حەزکەن حەیوان بلەوەڕێنن و لەو جۆگە ئاوی بدەن. ئیتر ئەو دێهاتە لەو ناو و زەوی خۆیانە بێبەش بوون. لە کابرایەکی پێلوویم بیست وتی: لەو دەشتی پێلووەدا مەڕەزەم ئەکرد، بە بێڵەکەمۆ کیتەڵەیێن هاتە دەرێ، وا دیار بوو کیتەڵە کەرەی زەمانی زووی جاف بووبێ.

٣. مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆڕی (رحمەالله) کە لە ساڵی ١٠١٤ قەمەریا کۆچی دوایی کردووە، ڕۆیوە بۆ دەشتی خاومیرلوا بۆ ناو خێڵەکانی جاف کە مۆجگاری خێریان بکا و ئاشنایان کا لەگەڵ دین، دەریان کردووە و سەگیان تێ کردووە. ئەم مامۆستا پایەبەرزە لە کتێبەکەی خۆیا کە ناوی «تەبەقاتی شافیعی»یە ئاوای نووسیوە.

٤. ئەو جافانە حەیوانیان ئەکردە ناو خەلەی گۆران،کە ئەڕۆیین بۆلای گەورەکەیان بۆ شکات، ئەیوت: ئێمە ساقەکەی ئەخۆین و ئێوە دەس بگرن بە گوڵەکەیۆ با ئەیخۆین.

٥. قەدیمییەکانی مەریوان ئەڵێن: کوردە جافەکان لە خێڵەژوور و خێڵەخواردا گۆرانیان تالآن کردووە و هەرچێکیان بەرپەڵ کەوتایێ ئەیان‌برد، لە ئەختینە و مس و فەرش و پێخەف و ئاژەڵ، وە زۆر بە ئازاییان ئەزانی. ئەچێنیی ئەیانوت: ئێمە بیرێ لەناو دێکەمانا بوو کە جاف بە دەورمانا بوایە هەرچی مسمان ئەبوو ئەمان‌خستە ناو ئەو بیرە لە ترسی جاف.

٦. وەکوو لە ئاسرخان کانی‌سانانم بیستووە لە رووی کتێبۆ باسی کرد، حاجی هەیەربەگ (حیدربگ) لە دەورووبەری ساڵی ١٢٩٠ قەمەریا لە ئاوایی دەرەتفێ لە دەوری خسنەکەی کابل مەریوانا لەگەڵ نۆکەرێکی تووشی حەمەی ئەحمەدبەگی جاف ئەبێ بە شەش سواری تفەنگ بەدەسۆ، ئەڵێ: هەیەر دەرێێ کوڵ تۆ گەرەکتە تەرکی ئەم وولآتە کەی بە ئێمە؟ ئەبێ بتکوژم، هەیەربەگ زۆر ئەپاڕێتۆ وازم لێ بێنە و مەمکوژە، هەر واز ناهێنێ تا ئەونە زۆر ئێنێ بۆی، هەیەربەگ بە قنگەشەڕ خۆی ئەخاتە ناو خسنەکەی کابل، ئەڵێ: لەبەر خاتر ئەم شەخسە وازم لێ بێنە، ئەویش هەر واز ناهێنێ، خۆی و نۆکەرەکەی یەک تفەنگیان

پێ ئەبێ، لە ناچارییا خۆی یا نۆکەرەکەی، حەمەی ئەحمەدبەگی جاف ئەکوژن. سوارەکان رائەکەن بۆ ناو خێڵەکەی خۆیان لەبەر دێی «بەرقەڵا»، لەویا کانییەک هەیە بە ناو «کانی حەمەی ئەحمەد جاف» کە هەوارگەی خۆیان بووە. پیرەژنێ پیر و کوێر لەو خێڵە جێ مابوو بەناو «نەنە خاتوون» کە ماڵی لە بەرقەڵا بوو ئەیوت: من لەبیرمە کە لەگەڵ ئەو خێڵا لەسەر ئەو کانییا گەورە کچ بووم لە دەوری دەواری حەمەی ئەحمەدبەگا دوازدە ئاخوڕیان بەستوو، دوای کوشتنی حەمەی ئەحمەدبەگ دونیا لە هەیەربەگ تاڵ بوو، هەیەربەگ لە ترسا بە ماڵۆ ئەڕوا بۆ هەورامان، پەنای ئەدەن تا ماوەیێ زۆر، وە جافەکان ناتوانن هیچ تۆڵەیێ کەنۆ. دوای بەینێ حاجی هەیەربەگ بە ماڵۆ یێتۆ بۆ مەریوان. جا با بزانین کە حاجی هەیەربەگ پیاوی لێهاتوو و بەدەسەڵات و زیر و بڕوا پێکراو بووە، نوێنەری کوردی مەریوان و دەوروبەری بووە، لە تاران مەعاش و بەرهەمی ساڵانەی دوازدە تمەن بووە، هەیەر بەگ یەکێ لە شەش کوڕەکان ئەسکەندەر بەگ دەرەتفێ بووە، کە زووتر لە دێی «نونو»وا بوون، ئەوانی تری ئەمانەن:

١. فەتالی بەگ باوکی فەتالیبەگی.
٢. حەمەکەریم بەگ باوکی حەمەکەریمبەگی.
٣. حسەین قولی بەگ باوک بەگەکان بالک.
٤. حەمەد بەگ باوک بەگەکان گوێزەکوێرە.
٥. حەمەڕەزا بەگ باوک بەگەکان بەیەڵە و لەنجاوا.

وە هەیەربەگ بە حەوت پشت ئەچێتۆ سەر «کەلب عەلیخان» کە ماڵی لە خەڵووزە بووە و وەکوو مەرزەبانی ئێران وابووە. لەو سنووری ئێرانا قەبری وا لەخەڵووزە کە لەو وەختا دێیەکی باش بووە و ەکوو ساوجی ئێستا. حەوت پشت بە قسەی قەدیمی هەر پشتێ سی (٣٠) ساڵی پێچووبێ ئەبێ بەینی ئەسکەندەربەگ و گەڵباخیخان دووسەدوده (٢١٠) ساڵ بووبێ.

## بەشی سێهەم
## باسی خانئەحمەدخان و کارەکانی
(شەڕ خۆش نیە شەڕنامەی خۆشە)

خانئەحمەدخان ئەردەڵانی لە بەختا لەدایک بووە، یانی لە ١٠٠٢ قەمەرییا، لە کەچبەختا شێت بووە یانی لە ١٠٢٥ قەمەرییا، لە غەمهادا تیاچووە یانی ١٠٤٦ قەمەرییا. کە خۆی داوە بەدەم ئاوەکەی زەڵمۆ.

ئەمە مەلا عبدالله «شەیدا»ی تووتمەری مەریوانی لە کتێبی «سەلاتینی هەورامان»دا نووسیویەتی، زۆر شتی سەرسوڕهێنەری وا تێدا، ئێوەش سەرنجی بدەن و موتاڵای بکەن.

خانئەحمەدخان زۆر ئازا و نەترس و لێهاتوو و کوڕە خاسە بووە. شاعەباسی گەورە کچێکی پێداوە بەناو کلاوزەڕخانم. مەرزەبانێ باش بووە بۆ بەرزی وولاتی ئێران، سەرسەختەکانی هێناوەتە سەر هێڵ. هەر لە شاری سنەووَ تا ئازەربایجانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە نزیکی خاکی رووسیەدا تووشی قەڵای مەحکەم بوون، دەوریان داون تا چوار مانگ خۆیان نەیاوە بە دەسۆ، زەخیرە و تفاقیان تەواو بووە، بۆ تەگبیر و راکردن لەگەڵ سەرۆکەکانی لە لەشکرەکەی دوورۆ کەوتووەسۆ، ژنێ قسەخۆش و قەشمەرەیان تووش نەبێ، ئەڵێن: دادە نازانین بۆچی ئەم قەڵامانە بۆ ناگیرێ؟! ئەویش ئەڵێ: دەلیلی بێکارەیی خۆتانە، من لەو قەڵا مەحکەمتر بووم شووەکەم نەترس و کوڕەخاسە و ملهوڕ بوو، خۆی پێوەنا و گرتی. قسەی ئەو ژنە ئەبێ بە غیرەتی گەورە بۆیان و پەشیمان ئەبنۆ لە راکردن، ئەڵێن: «زدن مردی و گریختن مردی» دەسێکیان پیا بێنین. جا ئەڵێن: دادە تۆ بزانی لەکوێوە ئەتوانین ئەو قەڵابگرین؟ ئەڵێ: لەو پلانۆ بۆی سەرکەون. بە قسەی ئەو ژنە لەو پلانۆ سەرئەکەون و ئەیگرن.

دادە ئـافـەریـن لـەبـۆ تـەگـبیرت
خانت تەکان دا بە بیـــری ژیرت

خان‌ئەحمەدخان قەڵای زۆر و مەحکەمی دروس کردووە و سەرلارەکانی راسۆ کردووە، لەو زەمانا هەر نوستانێ شایێکی بووە. خان‌ئەحمەدخان شای نوستانی کوردستان بووە و شای هەموویان لە پاتەختی ئەسفەهان یا تاران بووە، پێیان وتووە: شاهەنشا. جا ئەم خان‌ئەحمەدخانە کوڕی هەڵۆخانی ئەردەڵانە کە پاتەختی لە «پاڵنگان» بووە. خان‌ئەحمەدخان چوار قەڵای بووە بۆ چوار وەرزی ساڵ: قەڵای حەسەناوا بۆ بەهاری، قەڵای پاڵنگان بۆ هاوینی، قەڵای زەڵم بۆ زستانی، قەڵای مەریوان بۆ پاییزی، بۆیە پێیان وتووە زەڵم جێی زەڵەمە و زۆردار بووە لەبەر خۆشی جێگە و زۆری ئاوەکەی.

١. قەڵای حەسەناوا کە دەوروپشتی هەر سەنگەر و ئاوو کانی و دار و درەختە. بۆ درێژی ئەم باسی خان‌ئەحمەدخانە تەماشای کتێبی «سلاتین هەورمان» بکە.

٢. قەڵای پاڵنگان کە پایتەختی هەڵۆخان باوک خان‌ئەحمەدخان لەوێ بووە لە شاری سنەوۆ زۆر دوور نیە.

٣. قەڵای مەریوان لای دێی بەرقەڵا، جا خوار و ژوور بە تەرتیب سێ قەڵان: قەڵای زیندانە کە بیرێکی تیا بووە و بۆ زیندانی بەکار هاتووە. قەڵای هەمارلو، کە ئاو و موهیمماتی زۆریان لەویا داناوە. قەڵای دامادە خاتوون کانی‌باو مزگەوتە سوورە وا لەبەر قەڵای هەمارلوا و بە خشتی سوور دروس کراوە بۆیە وا ناو نراوە، ئێستەیش خشتی زۆر وا بە دەوروبەریا. جا ئەو مزگەوتە وەکوو مامۆستا «عبدالکریم» رەحمەتی‌خوای‌لێ بێ، لەکتێبی «علمائنا فی خدمة العلم والدین» باسی کردووە، ئەمیر حەمزەی بابان بۆ کابلی مەریوانی دروس کردووە و لەوێ چەن ساڵ مودەرریس بووە، جا رۆیوە بە ماڵۆ بۆ «نۆڵۆکە» دێیەک بووە لە دێکۆتی ئێستەی دەرەتفێ، ١١٠ ساڵ بەر لە مەلا ئەبووبەکری رەحمەتی. وە قەڵاکە هەر بەدەستی بابانییەکان روخاوە و چۆڵ بووە و هەر بە داخی ئەو قەڵاوە ئەم شیعرە فۆلکلۆرە وتراوە:

قەڵای مـەریوان پـاڵـم دا پێوۆ
قەڵاکەم ڕۆخا ڕوکەم لە کوێوۆ

جا هەڵۆخان ئەردەڵان ئەو مزگەوتەی تازە کردوەسۆ بۆ «مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی» رەحمەتی‌خوای‌لێ بێ. وە ئەو شیعرە بەسەر درگای مزگەوتەکەوە نووسراوە:

مسـجدی عـالی هلوخانی
حیفش ان است زود شود فانی

وە مووشڵەی پێ بەخشیوە بۆ خەرجی خۆی و فەقێکانی، ١٨ ساڵ لەو مزگەوتە سوورە ئەو مامۆستا پایەبەرزە مودەڕڕیس بووە و کتێبی زۆری نووسیوە، بۆیە مەشهوور بووە بە موسەننیف، زۆرترینیان لەو مزگەوتا نووسیویەتی.

لە کتێبە دانراوەکانی مەلا ئەبووبەکری چۆڕی ئەوانەی وا پێمان گەیشتبێ و ناویشی بۆمان ئاشکرا بێ حەوت دانەن:

١. «وضوح» کە چوار بەرگە و شەرحی کتێبی «محرّر»ی ئیمامی رافیعییە لەشەرعی مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا _خوالێیان‌رازی‌بێ_ وە ئەو کتێبە زۆر مەسەلەی وا تیا کە بۆ ئەم وڵاتی ئێمە زانینیان زۆر لازمە. ئەم کتێبە بە زمانی عەرەبی ئاسان دانراوە و مەلا ئەبووبەکر لە مزگەوتە سوورەی مەریوان دایناوە و ئێستە وا بەدەس مەلاکان ئەوقافی شاری سلێمانییێ کە هەر مەلایەک بتوانێ بەشێکی ئامادە بکا بۆ چاپ و بیکا بە «پایان‌نامە»ی دانشگا کە خۆیان پێی ئەڵێن «کلیە شرعیە»، بۆی حیساب ئەکەن. وە بەشی ئەووەڵی کە مەلا مەحموودی کوڕی مەلا عبداللە ئارمەردەیی ئامادەی کردووە و وێنەکەی لای من دەس دەکەوێ.

٢. «سراج‌الطریق»کە لە ساڵی ٩٨٥دا نووسراوە بە زمانی فارسییە و رێک و رەوانە و باسێکی عیرفانییە و چاپ کراوە و لە هەموو لایەک دەس دەکەوێ.

٣. «ریاض‌الخلود» بە زمانی فارسییە و لە ساڵی ٩٨٩دا نوسراوە و چاپیش کراوە کە هەمووی حیکایەت و پەند و ئامۆژگارییە.

٤. «آفتاب» هەمووی ٢٦ دەسە شیعرە لە لە حەرفی ئەلیفەوە دەس پێ دەکات وە چاپ کراوە. کە لە ئاخر هەموو دەسە شیعرێکەوە ئەم شیعرە دووبارە کراوەتەوە:

یا نبـی رد مکن بـضاعـت مـا
سعی فرما ی در شفاعت ما

٥. «طبقات الشّافعیّه» کە باسی تاریخی و ریزبەندی زانایانی شافیعییە، وە هاوزەمان بوون لەگەڵ یەک، ئەم کتێبە لە بەیرووت و بەغدا چاپ کراوە و وێنەیەکی لای من هەیە.

٦. «سراج التّاریخ» وەکوو لە ناوەکەیۆ دیارە باسی تاریخی ئیسلام ئەکا کە ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلامی تێدایە هەر لە لەدایک بوونیۆ تا وەفاتی، وە چۆنیەتی سەرکەوتنی دینەکەی و پەرەسەندنی لە کوردەواریدا و لە کوێ حکوومەتی ئیسلامی بووە و کێ ئەم حکوومەتەی بردووە بەڕێوە و لە کوێ بوون و چۆن بوون، زۆر بەداخەوە کە ئەم کتێبە فەوتاوە، زۆر بە کزی و لاوازی ئەپاڕێمەوە لەو خوشک و برا موسوڵمانانەی کە هەواڵی ئەم کتێبە ئەزانن بیخەنە دەسمان تا بەڵکوو بیخەینە بەرچاوی خوێنەران کە فەخرە بۆ ئیسلام و کوردستان.

٧. «تذکرة السلاطین» ئەمەیش کتێبێکی تەئریخییە و باس ئەکا لە سانەکان هەورامان کە چۆن بوون و لەکوێ بوون هەڵسووکەوتیان چۆن بووە بۆ خۆیان و خەڵک. وە مەلا عبدالله، شەیدای تووتمەری لەو کتێبە کتێبی سەلاتینی هەورامانی دەرهێناوە و چاپیش کراوە. حەیف زۆر حەیف ئەم کتێبە ئێمە بزانین فەوتاوە و تاقە کتێبێ لەوە بە دەسۆ بووە کە یەکێ لە ئینگلیسییەکان بە پووڵی زۆر سەندوویە و بردوویە. جا تکا ئەکەم لە کەسێ کە ئەم کتێبەی لایە ئەی‌شارێتۆ پیدا پێمان با چاپی بکەین و تۆشە بێ بۆ قیامەتی.

ناوی ساڵح بەی رەحمەت ئەبارێ
نەک تەنیا جارێ بۆ هەموو جارێ

وە بێجگە لەوانە هەرکتێبێکی‌تری مەلا ئەبووبەکری رەحمەتی لاتان هەیە کەرەمی کەن تا بیاندەین لە چاپ.

جا کە مەلا ئەبووبەکرلە مزگەوتە سوورە ئەماوە باری کردووە و رۆیشتووە بۆ دێی «مووشڵە» کە دێیەک بووە لەباتی «نژمار»ی ئێستا، دوای ساڵێ هەڵۆخان رۆیوە بۆ دیدەنی، بەردێ بووە کە چرای بەسەرۆ داناوە و چراکەش رۆنی ئەماوە و هەر گڕاوە، ئیتر چۆڕ و ئەنەی بە موڵکی پێ بەخشیوە و دوای ساڵێ موسەننیف چۆری ئاوەدان کردووەسۆ و لەو دێ بووە تا ساڵی١٠١٤ قەمەری فەوتی کردووە و مەرقەدی موبـارەکیش وا لەوێ.

مزگەوتە سوورەی مەریوان ئیمامێکی بووە بەناو سەیدئەحمەد ئەنباری، ئەنبار شارێ بووە لە باشووری بەغدا و ٤٠ کیلۆمەتر لەوێوە دوورە و وا لەلای بەحری دیجلە کە زووتر پاتەختی عێراق بووە.

٤. یەکێتر لە قەڵاکان خان‌ئەحمەدخان قەڵای زەڵمە کە لەویا بە بەرد بەنداوێکی دروس کردووە کە مەنعی ئاوی زەڵم بکا لە شارەزووری کە دیوار و شوێنەواری هەر ماوە و وا لەبەرچاو هەموو رێبوارێکا. وە لەوێ بە تەمووی شاخێ بەرزۆ غارێ هەیە کە خەڵک بە گوریس خۆیان دائێڵن بۆ ناوی و لەناوەوە چوارگۆشەیێکە حەوزێکی وا تیا پڕە لە ئاو، نە کەم ئەکا و نە زیاد. بیستوومە لە خەڵکی زەڵم کە خان‌ئەحمەدخان لە زەڵما خەرج و باجی زۆر سەندووە لە شارەزووری، وە ئەگەر ناوی زەڵمیشی پێ‌دابن بە تەماع و پارە بووە. «قەڵاخانی» کە جێیەکی زۆر خۆشە لە خاکی «دەرەوکێ» لە مەرزی عێراق لە نزیکی کەماجاڕ و لە پشتی دێی زەڵم بەرەو باکوور، کە خان‌ئەحمەدخان زۆر لەوێ ماوەتەوە و ئێستەیش بەهاران جێگای سەیران و کەیف و سەمای خەڵکی مەریوان و هەورامانە، هەورامی ئەڵێن: هەر لەبەر خان‌ئەحمەدخانە کە پێی ئەڵێن «قەڵاوخانی».

خان‌ئەحمەدخان دوو قەڵایشی لە هەورامان بووە:

١. قەڵای پیرڕۆسەم، کە چێشتخانەی ئەو قەڵا لە «حەوش و بارانی» بووە، کە کانیێکی زۆر خۆشە لە بەینی دێی «دەرەوکن» و «دەمەیەو»، ئەڵێن ئەونە نۆکەری زۆر بووە بە دەساودەس لەوێوە چێشتی گەرمیان گەیاندووەتە قەڵای پیرڕۆسەم. بەڵام ئێستا حەوشوبارانی ماڵی تیا کراوەسۆ و ئاواییەکی تازەیان دروس کردووە هەر بەو ناوێ، وە کانی و ئاوەکەی وەک جاران خۆش نەماوە.

٢. قەڵای پشتی ئاودێ، لە باکووری شاری هەورامان، لەناو شاری هەورامانۆ دیارە، کە بەبەرزی چوار مەتر دیواری دیارە و ماوە، بە گونجی خاکی سوور بۆ ئاوی کانییەکیان بردووە بۆ ئەو قەڵا، بەو ئاوە بەڕێ چوون.

## بەشی چوارەم

## حەسەنبەگی کانیمیران

### یەکێتر لە دەرگیری لە بەینی کورد و گۆراندا

دوای ئەو هەموو زوڵم و زۆرەی جەناب حەسەنبەگ کانی میرانی کوڕی- حەمەکەریمبەگ برای حسەینبەگ بێلوو، چوار ساڵ لە پێش رووس و گیرانەکەدا لە ساڵی ١٤٣٠ قەمەریدا ئەکەوێتە خەیاڵی ئەوەکە نەهێڵێ لە مەریوانۆ جاف بێن بۆ ئێران، لە زستانا ئەکەوێتە گەڕانی دێهاتەکانی مەریوان و هەورامان و کۆماسی و گەڵباخی و دێی لێ دەرناکا، قەولیان لێ ئەسێنێ کۆمەکی بکەن لە ئەهاتن جافا بۆ مەریوان، وە هەر دێێ تفەنگچییێکی بۆ بەنێرێ، تفەنگچی بالک حەمەمەلا بووە کوڕی مەلا عبدالصمد هەجیجی بووە.

وەکوو لە حاجی حەمەل باشماخییم بیستووە و خۆم حەمەمەلام دیوە و وا ئەزانم لە ساڵی ١٣١٨ هەتاوی لە عومری ٨٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. زۆر قسە خۆش و شۆخ بووە، دوو کچی لێ بەجێماوە خەجێ و خۆشی و هاوعورین.

حەسەنبەگ دەنگ ناکا تا لە ئاخر مانگ بەهارا جافەکان لە دەشتی پێنجوێن و قزڵجە کۆ ئەبنۆ بە نیازی ئەوە لە مەریوانۆ بێنە ئێران. حەسەنبەگ ئەو تفەنگچییەیانە کە زستان قەولیان پێ داوە جەم ئەکات وە لە هەردی کانیمیرانۆ تا

بەردە بووکەکان و تا جەژنی ناوا تا شەخسەکەی حەوتەوانان بەبێ بەین سەنگەربەنی ئەکا و ئەنێرێ لە شار سنەوۆ لۆتی و سوڕنا و دهۆڵ ئێنن لەسەر تەپێکا لەو ڕێگەیانا بە شەو و ڕۆژ دهۆڵ و سوڕنا ئەژەنن. ئیسەیش تەپی سوڕناودەهۆڵکە مەشهوورە. ئەمجار ئەنووسێ بۆ گەورەی جافەکان خالۆ حەمەمینی سەلیم: ئێمە ئیمساڵ نایێڵین جاف لە مەریوانۆ بێن بۆ ئێران بگەڕێنۆ با ئەتان کوژین، بە ناونیشانی تەپی سوڕناودەهۆڵەکە.

جا حەمەمین سەلیم بە هەڕەشەوۆ ئەڵێ: حەسەنە ورگن چۆن ئەتوانێ تەرکی ئێران بکا بە ئێمە. جا سووارە و تفەنگ بەدەسەکان جاف قوو ئەپێکن و قوڵ ئەنێن و بێن بۆ سەریان لە راسەڕێی دەشتەکەوە ئێنە بەردەسیان تفەنگچییەکان حەسەن بەگ دەس ڕێژێکیان لێ ئەکەن لە جێوە ١٥٠ سواریان لێ‌دائەخەن، باقییەکەیان بە ڕۆڵەڕۆ باوکەڕۆ و براڕۆ بە مەیت و بریندارەکانۆ ئەڕۆنۆ بۆلای حەمەمینی سەلیم. ئەویش دوونەوەی‌تر داخ ئەچێ بە دڵیا و تووڕە ئەبێ و لە نۆبەی خۆیا لەگەڵ چەن سواری کوڕەخاسە و تفەنگچی لە بنار و ناو داری باشماخ و ساواوە ئێن بۆ سەر هوردووی حەسەن‌بەگ کانی‌میران، کە نزیک ئەبنۆ تەقەیان لێ ئەکەن ١٢ سواریان لێ دائەخەن کە یەکێکیان حەمەمینی سەلیم ئەبێ، جا بە ڕۆڕۆ و بە مەیت و پێکراوەکانۆ ئەگەڕێنۆ بۆ پێنجوێن.

ئەو شکستە خواردیان ئیتر رای‌تر نەیان‌توانی جاف لە مەریوانۆ بێن بۆ ئێران، جا مەریوان بۆ هەمیشە ئەجاتی بۆو بەدەس شەڕ خێڵەجافۆ.

با بزانین میوانداری حەسەن‌بەگ و کانی‌میرانی بۆ ئەو میوان و تفەنگچییە بە ریزان چۆن بووە: حەسەن بەگ دەوڵەمەن بووە و وتوویەتی بە کانی‌میراتی: ئێوە نانیان بۆ بکەن و چێشتیان بۆ لێ بنێن، هەرچێکتان ئەوێ لە ماڵ ئێمە بیبەن، کانی‌میرانی هەرکامیان تفەنگچی بووە، شەڕی کردووە باقییەکانیان بە ژن و پیاو و گەورە و بچووکۆ خزمەتیان کردووە بەو میوان و تفەنگچییانە، جا دوای ئەو شەڕە کانی‌میران ناوباتگی دەرکردووە بە دەروازەی مەریوان. با بزانین زووتر بە کانی‌میرانیان وتووە «گەیگەچان».

ئەم باسی حەسەن‌بەگ و کانی‌میرانە لە کاکە حەسەنی کوڕی مەحمووی عبداللەی کانی‌میرانیم بیستووە لە ماڵی خۆیانا لە مەریوان لە هەوەڵ مانگی زستانی ساڵی ١٣٧٥ شەمسی، جا ئەویش خۆی لە عبدالله باوەگەورەیۆ بیستووە کە عبدالله خۆی کانی‌میرانی بووە و لەو شەڕی حەسەن‌بەگا تفەنگچی بووە ، کە حەسەن لە ناوخۆمانا بەناوباتگە بە حەسەن خولە عەبە.

تەواو بوو

ڕۆژی ١٤ خاکەلێوەی ساڵی ١٣٨٩ی هەتاوی

## بەشی پێنجەم لە تەئریخی بە نرخ باسی بالک

بسم الله الرحمن الرحیم

حەمد و سەنا بۆ خوایە کە فەرمویەتی : مـن خـەزێـنەیـە شـاراوەبـوم کـەس نەیەناسیم خەڵکم دروست کرد تا بمناسن وە سوپاس بۆ خوای گەورە کە گرۆی بەشەری جیا کردونەسۆ کە عەقڵ و شوعوری پێ داون . وە تەکلیفی ناوەسە سەر شانیان ڕەهبەری بۆ ناردوون کە لە هەڵە بیان پارێزێ بیان خاتـە سـەر ڕێـگەی ڕاس کە سەربەرزی هەر دو دونیا بن . وە ئەو ڕەهبەرانە پێغەمبەرانن وە جێگەداری ئەوانن عالم و زاناکان لە دیندا .وە هەر کەس پەیڕەوی لەوان کا شەریکی ئەوانـە لە هەمو خێر و بیرێکی دونیاو قیامەتدا .

سەلام وڕەحمەتی خوا لـە سـەر هـەمویـان تـا دونیـا تـەواو نـەبـێ. وە بـاقی گیان‌دارەکان و بێ‌گیانەکان کۆمەکی ژیانی خۆش‌گوزەرانی بەشـەرن بـەتایبـەت ئەوانەی کە ئەشنو نومایان هەیە. هەمو گیـان دارەکـان وەهـا دروس بـوون کـە هەمیشەو دایم موحتاجن بە خواردن و خواردنەوەو هەزمی ئەمانە . وە بـە مـاڵ و خەو و جێ خەو و ئیستراحەت و کەسابەت و سیاحەت و مانئو حەسانئەوە ئەمانـە گشتی بۆ سەرکوت کردن بەشەرە کە هەمیشە خوای لە بیر بێ کـە ئـەم هـەمـو نێعمەتەی بۆ ناردووە کە سوپاس بکا کە بەردەوام زیادیان بکا بۆیان . وە لە عیلمە بە نرخەکانە زانینی تەئریخی پێشوەکان بـۆ ئـەوە لـە خواسـتەکانیـان دەرس و مۆجکاری وەر گرین وە لە خراوەکیانیان عیبرەت و ئەفرین . وە بۆ هەمو کـەسـێ زانینی ئەم تەئریخە لازم و بە کەڵکە کە فێری خەڵکی‌تریـشی بکـا . وە منـیش بەش بە حاڵی خۆم بازێ لە تەئریخی ئاو و خاکی بالـک و میللـەت و مزگـەوت و مەلا وفەقێی بالک ئەنوسمەوە . بە تەمام لە ناو بردن ئەوانە خێر وبەرەکەت برژێ بە سەرما کە خۆم بە قەرزار ئەزانم کە ئەینوسم . کە خۆم لەوێ لە دایک بووم لە ساڵی ١٣٠٥ شەمسی لەوێ بە خێو بووم وە لەوێ خوێندومە تا سەرەتایی وە تـا چووم بۆ فەقێیەتی تا هاتومەتو بۆ خوێندن بۆ بالک وە لەوێ لە خزمەت باوکما لە ساڵی ١٣٣٠سێ ئەفەری ئیجازەمان وەرگرت مەلا موحەممەد بـەداغـی و مـەلا

یۆسفی فەتتاحی ڕەفیقی و من . وە لە دوای فەوتی باوکم کە سالی ١٣٥٠ بوو دە١٠ سال بە تەوفیقی باشۆ مەلای مودەڕڕیس و پێش نوێژی جومعەو جەماعەتی بالک بوم .
وە ئیسەش لە هەر کوێ بم دلم هەر هالەگەل بالکی وە خۆم بە شەریکی خێر و شەڕو شادی و شیوەنی ئەوان ئەزانم . خوا سەربەرز و شان بەرزیان بکا میللەتی زۆر نەجیب و کاسب و بە دین وجیاوازن لە خەلک

## ( میللەتی بالک )

بالکە کۆن لە بنەڕەتدا دوو مال لە بنەمالەی (میروەیس ) و ( قەیخاوەیس ) ن ئاوەدانیان کردووە سۆ . کە دارساتی چڕ و پڕ بووە . بە ڕەسمی ئەو ڕۆژە بە ڕەشە مال یانێ بە دار لە لای کانیوەزمەکە دو مال فەقیرانەیان دروس کردووە . بە نیرگەو و کۆلەکەو دەسەک و خێزەرو گورگەو گەلا خانو کە لە لای مالە کانا جەمیان کردووە . کە بالکە کۆن کەم خێر و بێر و کەم ئاو بووە دوای سێ سال ئەو دوو مالە ئەم بالکە تازەیان ئاوەدان کردووەسۆ کە دارساتی چڕو پڕ بووە . ئەش کانی بە دەورا بووە . میروەیس سێ برا بوون ( میروەیس ، باپیر ، باوەیس ) میروەیس کوڕێکی بووە عەبەی میروەیس ئەوێش چوار کوڕی بووە بە تەرتیب ( یارە ، حەیبەللا ،ڕەحا ، ئەحلێ ) باپیر یەک کوڕی بووە حەمەکەریم ئەمیش دوو کوڕی بووە ( حەمەعەلی و ڕەحمان ) حەمەعەلیش سێ کوڕی بووە ( سۆفی سەعی ، حاجی حەمە تۆفێق، سۆفی ڕەشید ) باوەیس یەک کوڕی بووە دەروێش فەرەج ئەمیش سێ کوڕی بووە ( دەروێش عەلی و وەلی و حەمە ) قەیخا ووسەێ پێنج کوڕی بووە بەم تەرتیب ( کاکە حەمە ، خالۆ کەی خەسرەو ، ڕەسول ، ڕەحمان ، مسەفا ) کاکە حەمە یەک کوڕی بوو بە ناو کەریم لە زەمان ڕوسەکەدا سالی ١٣٣٥ ڕوس شەهیدی کردووە لە دواییدا خوا کوڕێ تری پێ دا بە ناوی عەبە. خالۆ کەیخوسرەو دوو کوڕی بووە بە ناو هەسەن و حوسەین . سۆفی هەسەن سێ کوڕی هەیە (حەمە ، عەبە ، مەحمو . حوسەین لە هەرزەکاریدا بە سواری ماین دابووی لە ئاوەکەی دەرزیان ئاو بردی و مرد .

ڕەسول دو کوڕی بووە جەلیل وخەلیل . جەلیل کوڕێکی بوو کە ڕەفێق من بـوو بـە ناو ڕەحیم . کچێکی لێ بە جێ ماوە بە ناو مریەم ژنی حەمەولییە لە بەرقەڵا یـە . خەلیل لە بالکا کچ و کوڕی زۆر بوو ژنەکەی لە سەیدەکانی بەرزنجە بوو بـە نـاو خەجێ بە ماڵۆ ڕۆیین بۆ بەرزنجە ئیتر خەبەریان نازانم . ڕەحمان کـوڕ قـەیخـوا ووسەین دو کوڕی بوو ( حاجی حەمەومین و حاجی حـەمـە سـەعـی ) مـسەفـا کوڕێکی بو بە ناو حەمە . ئەمانە هەر یەکێ سێ پشتم بۆ نوسیون ئیتر بە سە . جا کەم کەم خەڵکی تریش هاتوون بۆ دەور ئەو دو ماڵە کە بالک تازەیـان ئـاوەدان کردووەسۆ لە زەندی و غەیرە زەندی . وەکو لە قەدیمی بالکم بیستووە ئەوانە کـە زەندی بوون وە هاتوون بە ماڵۆ بۆ بالک خێڵ قەیخا ووسەین، خـێڵ حـەمـازیز ، خەلیفە عە بدوالله ، حەمە ڕەحیم وەئەوش ، حەمەی خاڵە بوون . وەکو لەم کتـێبا باسیان ئەکەین . هەمو بە کەڵک و باش بوون بۆ بالکی وە دانیشتوی بالـک . کـە سەرجەم تماشای ئەم کتێبە بکەیت بۆت دەرئەکەوێ کە بە بێ بەیـن میللـەتـی سەربەرزی بالک سەێ پەنجا ساڵێکە کە ساڵی ( ١٣٨٩)یە بـە هـەمـو هـێزێکۆ خەریکی خزمەتی مزگەوت و فەقێی بالکن وە بە بۆن ئەو خزمەتۆ لە هەمو لایەکۆ فەقێ هاتوون بۆ بالک لە تەولوی کوردەواری ئێران وئێراقۆ ئەیانناسن و ناسراون لە بیارەی شەریفە بوم دوو مەلای پشدەری هاتبون بۆ زیارەت بیارە یەکێکیان بە ناو مەلا عەبدوالله کە لە تایفەی مەلا عەبدواللەی بەیتوشی بو . ئەویشیان بە ناو مەلا موحەممەدی ڕەش کە لە بالکا خوێندبوی لە خزمـەت مامۆسـا مـەلا بـاقردا ئەونە حوڕمەتیان ئەگرت لە من تەرێق ئەبومو کە سەربەرزی بو بۆ خەڵکی بالک .

## بالک چۆن ڕێ کەوتووە

وا لە جنوبی شاری مەریوانۆ کە لە دە کیلۆمەتری جادەی سـەوڵـاوا و مـەریـوان قەراری گرتووە چواردەوری بالک ودێهاتەکانی دەور و بەری بە تەرتیب ئەمانەن لە شەرقۆ سەرکەل و وەسنەیە لە شیمالۆ گوێزەکوێرە و لەنجاوایە کە کێوێ بەرز بە ناوی بەڵخە چەرمۆ وا لە بەین بالک و گوێزەکوێرەدا خۆرەتـاوەکـەی بالکـەو نزارەکەی گوێزەکوێرەیەو ناو دارە ڕشتە کێوەکەی لە کـانی دار مازوارۆتـا کونـە

مشکاوی لەنجاوا لە غەربەوە بەیەڵەیە و بەرقەڵاو ڕیخەڵــانە . لـە جنوبـۆ چـەم گەورەی زریبارو دەرزیان و نژمار و شارانی‌یە . نەڵێن لەومو پێش دێی بالک لـە کلکەی خەزێنەکەی بالکا بووە بە قسەی قەدیمی پیرەژنێ لـە شـارەزور توشـی بالکی بووە ووتویەتی : من مناڵ بووم ماڵمان لە کلکەی خەزێنەکـەی بالکـا بـوو کانی و توویەک لە چەمەکەدا بوو . بەردە نوێژێ گەورەو پان لە سەر ئـەو کاتیـا بوو بۆ ئاو ئەڕوێن بۆ ئەو کانی‌یە . وە لە کلکەی خەزێنەوۆ ڕێگەیـە ڕۆیـی‌وە بـۆ بەرقەڵا بە ناو ڕوسەری کە ئیسە شوێـنەواری دیـارە . ئـەو وەختـە بـەرقـەڵا مەرکەزی مەریوان بووە . بۆ حاکمی ئـەردەڵــانیەکـان . بالـک هـەردوو ئـاودارو دارسانی زۆر تر بووە وە بەکەڵکتر بووە لە زەویوو زار و کێڵگەی کـە ئـەو هـەردە خزمەتێکی تەبیعەتی بوو وە هەیەتی وە ئاوداری وا لە ژورۆ . وە زەوی و زاری وا لە خوارۆ وە، ئەو هەردو دارسانە بەش بەش کرابوو بە ناو ئەهلی ئاواییدا بە ناو گەڵا جاڕ . هەر کەسێ پاسـی بـەشـی خـۆی ئـەکـرد وە ئیـسە یـەک سـەرە مـاڵ جەنگەڵبانی‌یە ئیدارەی بۆ داناوە بە ناو جەنگەڵبانی کە پاسی ئەکا .

## ئاو و خاکی بالک

ئەتوانین ئاوو خاکی پاکی بالک بکەین بە پێنج بەش .

١-یەکەم بالکەکۆن لە ڕۆژ هەڵــاتۆ . لـە ملـەی سـەرکـەلـۆ یـەتـە خـوارۆ بـۆ تەق‌تەقەکەی سەرکەل

کە ئاوی زۆر لە بەهارا یەتە خوارۆ بە تەق تەق بەو چەما کە زۆر جوانە کفـاوەکـاو ڕۆشنە . ئەو چەم بالکە کۆنە بە لای خۆر ئاوادا ئەڕواتە خـوارۆ تـا لای گـرد میـر وەیس لەوییەوە ئەچێتە سەر چەم کانی یە چیاوی . ئەم بەرو ئەو بەر ئـەو شـیوو دۆڵی بالکە کۆنە گەڵاجاڕە . وە کە یەیتە خوارۆ لای ڕاسۆ تا سەرشانەکان پـشت دێی بالک تـازە تـا خانـە گـێڵ تـا گـردی پـشتی شـەخـسە و دیونـەکـە تـا شەخسەکەیش هەموی خاکی بالکـە . کۆنـە خـۆرە تـاوەکـەی دارسـانەو زەوی ئەرمانی تیا نیە وەلێ بازێ زەوی هەیە لەو چەما لە نزیک ئەو شـەخسا بـە نـاو کوڕان حەمەی ڕەحیم خاتوون کە لە ژور زەویەکەوە کانی و هە سێریشیان هەس

. گوێزی چاک و بگر له سەر ئەو هەسێرا بوو .وه ئەو زەویە ئیسه باخـه ، گوێـزه تەڕەکاڵییه . وا ئەزانم ئیسته چاوەڕوان بین که له تەق‌تەقەکەی سەرکەلـۆ بـەو دۆڵا یەته خوارۆ لای چەپۆ زەوی سدیق ڕفیق حەمـەخانـه کـه بـازێ گوێـزی لەویادا داناوه وه لەویا نزارێ هەیه بەو نزاره گەورەداشیوێ هەیـه بـه نـاو شـیو پەڵکەکانی وه ناوێکی هەیه ، وه لەوێۆ بەرز ئەبیتۆ بۆ لوتکەی سەربەڵخ . کـێوێ بەرزه وا له بەین بالک و شاراتی و سەرکەلا . ئەو کێوه به لای خۆرناوادا ئـەڕواتـه خوارۆ تا چەم چەناخ‌چییان که هەردەکـەی وا بـه دەس ئـەهلـی شـاراتییۆ، نـاو وزەویەکەی وا به دەس نژماری یۆ وه ئەو کێوی سەربەڵـخه تـا چـەنـاخ‌چییـان نزارەکەی بالکەکۆنه خۆرەتاوەکەی شاراتی‌یه . له زەوی سدیق حەمه خان بـەرەو خوار لای چەپۆکانی و وزمەکه یه که جۆگەیه لەوکانی و چـەمـه بـه لای چـەپـا هەڵگیراوه بۆ تووەکان ڕەحمان سەله تا ئاوەڵ حسەین . وه تەوقێ هـەنجیـر وا لەویا وه له خوار ئەو کانی وزمۆ تا ئەگاته زەوی حاجی عەبەی ئەمین هەمو ئەرمانو به کەڵکه بو کشتوکاڵ . له خوار زەویو باخ کوڕان حەمەی ڕەحیم خاتون لەو چەما بناوانێ هەڵ ئەگیرا به لای چەپا بۆ زەوی سۆفی ڕەشیو کوران عەلی وەجه ئیـسه هەردوکیان چا و موتریان هەیه . ڕو به نژمار لەو ڕێگەوۆ ڕو بـه قیبلـه ئـەڕوا لای ڕاس و چەپۆ هەمو ئەرمانه تا لەق لەقان زەوی‌یه که شـەخسـێکی هـەیـه دارێ بەرزی بووه بۆ هێلانەی لەق و لەق . ئەو زەویانه وان لەویا تا کانی و شیو هەڵوژه ڕەشەکه تا حەمه کوژیاو تا چەنا خ چی یان مەشهور به زەوییه کان لـەق‌لـەقـان ناوێکی بوو بۆ هەر دەوان و دەشتەوان به ناو گۆمەکەی ساڵح سۆفی ئـەحمـەد . وه له شەخسەکەی لەق لەقانۆ بەرەوژۆر ئەڕواتۆ گردی میر وەیس . لـەو بـەینـا جوجه سازی هەیه . وه له خوار گردی میر وەیس وه لەو چەم بالکـەکۆنـا حـاجی عوسمان عەزیزی بیر و موتری هەیه .

## سێ ڕوداوی دڵ تەزێن له بالکه کۆنا ڕوی داوه

١- له سەر بەڵخ گەلەدار بڕین ماڵ حاجی زەهیر ئەبێ ڕەحمان بەگـی کـوڕی حاجی زەهیریان له گەڵ ئەبێ یەکێ له گەلەوانەکان بـه نـاو فـەتـەی فـەرەج

گەمەی لە گەڵ نەکا ئەویش بە گەمەوە نازانێ کە تفەنگەکەی ڤیشەکی وا تێدا مشتی لێ نەگرێ و گولەکەی دەرنەچێ ئەدا لە سەر سینەی فەتەو ئەیکوژێ .گەلەکەیان ئەشێوێ بە دارەمەیت فەتە یەننۆ بۆ پیر موحەممەد ئەینێژن فەتە کچێکی لێ بە جێ مابوو بە ناو فاتەی فەتە بە بەراوردی تەمەنی ئەوکچۆ وا دیارە ئەم کارە ساتە لە دەوری ساڵی ( ١٢٩٥)ش یا بوبێ .

٢- ئەحا بابە کە نۆکەر ماڵ حاجی زەهیر بو ژنێکی بو بە ناو ئەسمای کچی دەروێش کەریم تە ئاقی دابوو بیستبوی کە ڕەشە گە ئباخی داوای ئەسما ئەکا . کە ڕەشە لە سەر کەلۆ یەتۆ بۆ بالک لە خوار ملەکەی سەرکەلۆ لە دموەنێکا بۆی دائەنیشێ کە ڕەشە یەتە بەر دەسی گوللەیەکی پێوەئەنێ و ئەدا لە ناوگەڵی ئەکەوێ بە عەرزا ئەحا بەبە وا ئەزانێ مردووە ، ئەچێتە سەری ڕەشە گەڵباخی لە پاڵۆ گوللە یەکی پێوەئەنێ و ئە یکوژێ . بالکی ئەڕۆن هەردوکیان بە دارەمەیت یەننۆ بۆ بالک ئەحا بابە لە پیر موحەممەددا ئەسپەردە ئەکەن دوای خۆشۆ بوون ڕەشەگەڵباخی ئەسما مارەئەکا دوو کوڕ و کچێکیان بوو. ئەحا بابە کچێکی بوو بە ناو نامە کوڵفەت ماڵ مامۆسا مەلاباقر بوو . بە بۆن ئە و کچۆ وا دیارە ئە و کارەساتە لە دە ورەی ساڵی ١٣٠٠ش یا بوبێ . ئەحا بابە برایەکی بو بە ناو ڕەشە بالکی لە ناوایی ئەسراوادایە یا ئەیکرد یا ئەیتوانی تۆڵەی خۆی کاتۆ .

٣- پیاوێکی بالکی بە ناو حەمە فەتە لە سەر کەلۆ کە ئەهاتۆ بۆ بالک لە بەر پیری عەقڵی لە دەس دابووڕێگەی لێ شێوا بوو لە شیو پەڵکەکەدا مرد بوو .دوای دەڕۆژ بە کێف ماڵ دۆزیمانۆ هانیمانۆ کە کەڵکی شۆرینی ئەمابوو ، ( تیمم ) مان کرد و کفن و دفنمان کرد . لە پیر موحەممەدی بالکا لە ساڵی ١٣٦٥ ش

## بەشی دووهەم لە خاکی پاکی بالک بالکی تازەیە

ئەو ماڵانە کەوان لە بەری مزگەوتەکەوە ئەووەڵ جار دروس کراون وە لەوەبەرۆ تەنیا ماڵی حاجی زەهیر و ماڵی چکۆلەی ئەولقادر بوو . ئەو ماڵانە کە هان لەو بەرۆ هەموو لەم ئالۆ گۆڕا دروس بوون . لەماڵەکان بەر شێخ برایمۆ تا ماڵەکان کلکەی خەزێنەکە .

لە بیرەوەری منا باخ لە بالکا تەنیا چەمەنە کەو هەسەن بە تاقۆ . ئەو باخان دەوری مزگەوت و حەوز و کانی خوارەوە بوو کە هەموو باخ بەگزادە بوون باخی خێڵی حەمە ئازیز بوو، باقی باخەکان گرد خاتو عاسییە و پشت ئاوی بالک لە بەردە خەنەو تا پشت چەنەکەوۆ هەموی لە زەمان ڕەزا شادا دانران کە لە ساڵی ١٣٠٩ش وە یانزە ساڵ شای ئێران بوو . تا قەزای شەهریوەر ساڵ ١٣٢٠ ئەو باخانە کە لە هەمو دێهات مەریوانا دانراوون دەوڵەت زۆری ئەکرد لە قەیخای دێ ئەویش زۆری ئە کرد لە میللەت بۆ دانانی باخ کە لەو دارسانە ڕیشەی دە وەن کەنن بیکەن بە باخ . لە مزگەوتەکەوە ڕێگەیە ڕو بە قیبلە ئەڕوا بە ناو قەبرسان پیر موحە ممەددا کە خسنن چکۆلەی هەیەلە بەر ڕێدا لە خوار قەبرەکەی ئەلی بەگۆ کە لە ساڵی ڕوسەکە ساڵی ١٣٣٥ ی قەمەری شەهید بووە لە ناو تاقی گاڕان . لە بەین ماڵ ئەحا ڕەزیەی کەیانی و شەخسەکەی پیر موحەممەددا لە خوار ڕێوۆ ئەوقن دار هەیە چوار نەفەر گومناو شەهیدی ساڵی ڕوسەکە وان لەویا .کە بە دەرەجەی غە ریب و شەهیدی کوژراوون وە لەویا نێژراون . وە لە گەڵ ئەلی بەگا کەریم کوڕ کاکە حەمە قەیخوا ووسەین ڕوسەکە شەهیدی کردوون . ئەلی بەگ دایکێکی بوو بە ناو خاتو حەنیف وادەزانم لە بەگزادەکانی بەردەڕەشە بوو. وەسیەتی کردبو کە مردم لای ئەلی بەگا بمنێن پەسەکەکەی کەن بە سەرینم بەشکو خوا بمبەخشێ کە مرد وەسیەتەکەیان بۆ بەجێ هاتی . من وا ئەزانم ساڵی ١٣١٢ش بوو ئەو مردووانە کە لە بالکا مردوون بە ژن و پیاوۆ هەمویان بە ئیمان و عەمەلی ساڵحۆ مردوون کە هەمیشە لە گەڵ دین و مزگەوت مەلا و فەقێ دا بوون . مەرقەدی مامۆسا مەلاباقر و خەلیفەئەحمەد هان لە ئاخر قەبرەسانەکەوە

لای چەپۆ بێشکەیەکیان هەیە بۆ دیاری کە لەو ڕێوۆ بەرەو قیبلە ئەڕۆیی ئەم بەرو ئەوبەر ڕاس و چەپ هەمو گەڵا جار بوون کراون بە باخ کە بازێکی وەکو دارستانەکە ماوەتۆ . کە گەییت بە شەخس و دیونەکە ئیتر بالکەکۆنە . ئەو مردووانە وان لەو شەخسا بازێکیان وان لای ڕاسۆ بە بەرزیوو بازێکیان وان لای چەپۆ لە نزمییا وە لە بەین ئەوانا مردووی ناو هەموویان زۆر دەرهاتی وە ئەو باخان بالکە لە بەر فرە بەشی زۆریان فەوتاون کەم کەم ئە بێتۆ بە دارسان . بە دەوری بالکی تازەدا شەش کانیو ناو بووە ١- کانی خوارۆ ٢ – گانی حەوزەکە کە ئەو دوو کانییە کارێزن ٣- کانی شیرین کە شیرینی ژن مەلا عەبد الصمد کە ماڵیان لەویا بووە و چاودێری کردووە . ٤ – کانی حاجی ئەحمەد خەو خۆش پێنجوێنی کە ماڵی لەو نزیکا بوومو چاودێری کردووە کە ڕۆییوەتۆ بۆ پێنجوێن ماڵەکەی داوە بە مامۆسا مەلا باقر کە ئیسەش ماڵی مەلایە من لە پێنجوێن کوڕێکی حاجی ئەحمەدم دیوە بە ناو عەلی ماین ڕەش وکچێکیم دیوە بە ناو ڕەحمە . ٥- کانی گوێز ٦ – کانی ژورۆ بە ناو کانی قەیخا ووسەین کارێزە ئیسە ئەو کانیانە زۆریان بە یۆن چاو و موتور ئاویان ووشک بووە . لەو کانی ژورۆ ڕو بە شیمال لە بالکۆ ڕێگەیە ئەڕوا لای ڕاسۆ چەم و چەمەنەکەیە لای چەپێۆ ئەگات بە قەبرەسان چەن مردویەکی واتیا بەردی پان لەویا بوو وەکو جێگە سمی ئەسپ چاڵێکی تیا بوو ئەیان ووت : ئەمە جێگە سمی دوڵ دوڵی حەزرەت عەلییە کە ڕێیشی تێ ناچێ حەزرەت عەلی ڕێی کەوتبێتە ئەم ووڵاتە . بالکی ئەو بەردیانە شکان بۆ ماڵ کردنەوە . بەینی کانی ژورۆو ئەو شەخسە کە بەرز ئەبێتۆ لای چەپۆ بۆ کێوی بەرز پشت شێخ ئیبراهیم هەردەکەی هەروەک دارسانەکەی جارانە کە بە کار باخ و زەوی نایی . لە شەخسەکەی شێخ برایم سەرکەوی ئە ڕوا بە ڕوی باخەکەی دەروێش فە رەج با وەیسا . کە چەمەنەکە تەواو بوو بە لای ڕاسا شێوو ڕێگەیە ئەڕوا بەرەو ژور بۆ وەسنە کە زۆر لێژە لە منالی ئیمەدا ئەیان ووت خەزێنەیە لەویا دۆزراوەتۆ قازانێ بووە . پڕ بووە لە قران چاو ڕەش ئەو شیوە ناوی شیو خیشکەکەیە کە لەو لێژۆ دار و گەڵایان هانیوەتە خوارۆ بۆ راسایی جا بە

کۆڵ و بە بار بردویانەتۆ بۆ بالک . شمالی بالک بەڵخە چەرمووە . کە لە کانی دارمازوار ۆ ئەڕوا تاکونە مشکاوی نزارەکەی ناو دارە بە ناوی گوێزان خاکی گوێزەکوێرەیە خۆرەتاوەکەی کەم ئاوە خاکی بالکە وە لەو دارستانا گەڵاجاری مینە عەزەیە کانی‌یە هەیە بۆ شوان و هەردەوان لە خوار ئەوۆ زەوی و گیا جاڕی کەریم مەرجانە کە لە شیو خیشکەوە ئاوی بۆ ئەهانی بۆ ئاۆ یەری لە پاڵ ئەو زەویا شەخسە مازوارەکەیە لە بەین شەخسە مازوارکەو کانی دەروێش حەمەدا کانیە قولی‌یە کە شێخ عەبدوڵڵەی کوڕی شێخ ئەحمەد ئەیکرد بە تەڕەکاڵی ، کانی دەروێش حەمە کارێزە بە زەحمەت ئاوی پەیا بووە بە ئاو چەمەکەو ئەو کانیە ناویەری چەمەنەکەیان ئەکرد لە زەمانی حەمە ڕەزا شادا لە ساڵی ١٣٥٥ کانی دەروێش حەمەیان بە لولە کەشی هانی بۆ ناو دێی بالک کە مەنبەعەکەی لە چەمەکەدا بوو ئیستەش هەر هەیە لولەکەشیە تریش کراوە کە ناوی چای عەمیقی دێی ڕیخەڵانە ، مەنبەعەکەی وا لە پشت ئاوایی یۆ . لە کانی دەروێش حەمە بە لای چەپا سەر ئەکەوێ بەو شیوو دۆڵا هەمو دارسانە زوو گەڵاجار بووە . وە لە ژورۆ لە و چاڵا کانی و ئاوێ هەیە بە ناوو زەوی و ئاو دەروێش فەرەج باوەیس کە ئەیکرد بە تەڕەکاڵی و بێسان ،بەش ئیتمەشی ئەدا زۆر خۆش بوو، لە بەرامبەریۆ گەڵا جار حەمە تەبن بوو کە کانییەکی هەیە ئەیکرد بە تەڕەکاڵی . لە ژور زەوی دەروێش فەرەجۆ هەسێر بارام کوپیکە بەو شیوا ڕێگەیە سەر ئە کەوێ تا کونە مشکاوی بە لای ڕاسۆ ئەڕوا بۆ گوێزەکوێرە لای چەپۆ ئەڕۆیی بۆ لەنجاوا . لە بەهارا لە بەڵخە چەرمو بەرەو خوار لەو شیوو دۆڵانۆ تا ئەگاتە بالک ئەو چەمە ئەونە ئاوی زۆر ئەبێ تا ئەگاتە ناوو دێ چوار پردی هەیە بۆ ڕێگوزەر ، یەک پردی لای کانی ژور دوو پردی لای ماڵ مامۆسا سێ پردی لای کانی شیرین چوار پردی لای حەوزەکە . کە ئەو چەمە ئەگاتە ناو دێ زۆرە ، هاژەی زۆر خۆشە وە لە گەڵ ئاو کانیەکانا تێکەڵ ئەبێ وە لە خوار ناودێوۆ ئەڕوا تا چەم گەورەی زرێبار وە ئەم چەمە گەورەی زرێبارە سەرحەد وسنوری جنوبی بەین بالک و دەرزیانە ، لە زەوی مزگەوت کوڕان سۆفییۆ بەرەوژور تا جوجە سازی لە ناودێ

بالک بەرەوخوار زۆر کانی و ئاوو هەیە، وە چەن بناوان هەیە ١ - لای کانی خـوارۆ بناوانێ هەڵ ئەگیرێ بۆ بەردێی بالک لەو نزیکا دەوڵەت هەسـێرێکی بـۆ دروس کردوون لەویا کاریتزێ هەیە کە ئاوی کاریتزێکە کە لەویا نوقمە لەو هەسێرا وە لە خوارۆ هەسێرێکی‌تر هەیە کە دەوڵەت دروسی کردووە ، بە شەو ئاوی تێ ئەکەن وە بەڕۆژ بەری ئەدەن بۆ ئاویەری . زوو ئەو ئاو بەردێ زۆر بۆو تـا دەور جـادەی مەریوان ئەڕۆی . من دیومە لە زە وی سەردەشت تا قەبرە موسایی تـەماکۆیـان کردووە . لە بەر هەسێری دووهەما جۆگەیە ئەڕۆیی بۆ کەر خۆراوا کە تەماکۆێـی پێ ئەکرا ئەو زەویانە لەویۆ بەرەو خوارتا ملەی دینار دێمن . سدیق عەلیە سـەن وە تایەر ئەسیری هەردو چای عەمێق و موتریان هەیە . لەو هەسێرە دوهەمـۆ کـە ئاوەکەی یەتە دەرۆ دوو جۆگە بە پاڵ جادەدا بە ڕاس و چەپا ئە چێتە خـوارۆ بـۆ ئەو زەویان بەردێ تا قەبرە موسایی ئەو چەم بالکـە تـازە ئـەچـێتە خـوارۆ هـەر بەشێک ناوێک و بناوانێکی هەیە ٢- لەو بناوان چەم بالکە لای ڕاسۆ ئـاوەکـەی ئەڕوا بۆ چەم خەلیفە تا بەر گردی بەردە چەخماخاوی وە کانی سۆفی هەسـەن و عەلیە هەسەن و حاجی سەعید وان لەویا ٣- لای ڕاسۆ بناوان چەم سەلەیە کە زەوی ڕەحمانە سڵە لەویا بووە ئەڕوا تا زەوی کوڕانی دەروێش سالـح و کـوڕان سەعای حەمە عەلی وە کانیە لەویا هەیە ٤- لای چەپۆ بناوانـەو لـە کانیـەکـەوە ئەڕوا بۆ سـەر زەوی کوڕانی سەعیدی حەمە ئازیزتا زەوی مامۆسا مـەلا بـاقر ٥- لای ڕاسۆ بناوان باڵا جۆگەیە ئاوێکی زۆری بوو بۆ ئەو زەویانـە لـە بـەر جـادەی مەریوانا کەوان لە ڕاس و چەپی ڕێگەکەی دەرزیان و تا سەر چە م گەورە لە بەر جادەی مەریوانا لە بەین ڕێگەی دەرزیانۆ ئاشە بەحری یا ئاشێکی ئەگێڕا بە نـاو ئاشە ڕەحا . کە هەر دوکیان ئاشە بەردینەی بەگزادە بون ، گێڕانی بوو هەردو سێ مانگ فەقیرێکیان ئەکرد بە ئاشەوان ئاردو پارەیان پێ ئەدان و مزەیان ئـەدا بـە بەگ زادە ئاشە بە حری لە ژورۆ بوو لە خوار زەوی دینار وە لای چەم زرێـبارا کـە لاڤاوو زۆر ئەبو دۆڵیانەکەی پڕ ئەبو لە ئاوو ئەوێسا ، ئاشە بەحری لە خوار سـەر کەلو جوجەسازی یۆ جۆگەیە تایبەتی بوو بە ئاو ئەو جۆگەو ئاو کانی دینار ئەگەڕا .

با بزانین ئاش وەسای ئەم دوو ئاشە کێ بووە وەسا مـەولـوو بـوە کـە لـە گـەڵ مەولان برایا لە شارەزور بە ماڵۆ هاتوون بۆ دەگاشێخان دوای چەن ساڵێ بە ماڵۆ هاتوون بۆ بالک لە دەوری ساڵی ۱۲۹۹ ی شەمسی ،کە بوون بە خـێر و بـێر بـۆ بالکی . خۆش سەلیقەو کاسب و دەسەڵاتدار بوون . وەسا مەولوود ۳ کوڕی بووە( سۆفی موحەممەد ، ئەحمەد ، عەبە) سۆفی موحەممەد دوای باوکی ئاش وەسـای ئەو ئاشان بالکە بووە . وە عەبەی نادریش ئـاش وەسـایی ئـەکـرد هـەر سـێ کوڕەکەی وەسا مەولوو ماڵیان لای مەزگەوتا بوو وەکو دیوەخان ئەو مزگـەوتـە وا بوون بو مەلا و فەقێ و ڕێبوار و میوانی ئەو مزگەوتە . خوا جەزایان باتۆ . ئەتـەوە یشیان هەر باشن . ئەحمەد وەسا مەولوو زۆر قـسەی خـۆش بـوو . دوو قـسەی خۆشی ئەنوسم ١-ڕایە بە کڵاشەکانیوۆ لە دارێ ئەکەوێتە خـوارۆ کـڵاشەکـانی تەوراس بڕێ لێی ئەداو لەتیە کا وە بازێ لە پایشی زەخمار ئەکا . ئەڵێ شـەڵـڵا کڵاشەکانم لە پاما ئەبوایە چش پایشم زۆرتر زەخمار ئەبوو پام خـۆش ئـەبـێتۆ چیبکەم لە کڵاشەکانم .٢ - ڕۆژێ ئەڕوا بۆ مازوو تا ئێوارە بەو هـەردا ئـەگـەڕێ مازوو چاوو ناکا بە دەس خاڵی یەتۆ هەڵە خزێ و دەسە گرێ بـە دەوەنـێ چـوار مازوو ئەکەوێتە مشتی ئەڵێ قەزای دەسم کەوێ لـە چـاوم . ئـەحمـەدی وەسـا مەولوو دوو کوڕی بوو( حاجی مەلا مەحموود ، حاجی حەمـەومـین ) حـاجی مـەلا مەحموود بۆ مەلایی زۆر باش بوو ئەمان ووت بۆ مەلایی ناکەی ئەیووت دڵم نایە مامۆسا مەلا باقر جێ بێڵم ، ڕاسیە کرد . زۆر بە ئەدەب بوو لـە گـەڵ مامۆسـتا و ئەتەوەی مامۆسادا.

سۆفی موحەممەد وەسا مەولوو دو کوڕی بوو . (حاجی حەسەن و حاجی حوسەین )و عەبەی وەسا مەولوو . ۳ کوڕی بوو ( حەمە ڕەحیم ، حەمەکەریم ، برایم ) ٦ - لای چەپۆ لە بەر زەوییەکەی ماڵ مامۆسا مەلا باقرا کە کانیە چەپاوییە بنـاوانێ هەڵ ئەگیرا بۆ زەوی خێڵ حەمازیز وحاجی مەحموود، سەعیدی تایەر پـردەکـەی جادەی مەریوان ئەو چەم کانی چاوی تا سەر چەم گەورە لای هەمو زەویـەکانیـا کانی هەیە . ٧- لای چەپۆ بناوانی زەوی مزگەوتە ، دوو بەشـە لای ژورووی وا بـە

دەس حەمە سالح دەروێش حەمەمینۆ لای خوارۆی وا بە دەس کوڕان سۆفی یـو حاجی فەتاحۆ . حاجی موحەممەد تا سەر چەم گەورەی زرێبارو بناوانی شێخ ئـەو گردە وا لە پشت زەوی مزگەوتۆ خاکی بالکە لەوەبەر سەنگەری بالکی پـێوە بـوو بەرانبەر بە هەورامی . کە ئژمار موڵکی دزڵی بووە . نۆکەری بالکی بە نـاو ڕەشـە گەڵباخی لە سەنگەرا ئەبێ تیانەیی یاپراخیان بۆ ئەنێرن . تیانە یاپراخـەکـە تـل ئەکاتۆ بەرەوخوارۆ ئەڵێ : من خۆم ئەنێم بە گوللەی هـەورامـی یـۆ یـاپراخ بـێ گوشت چۆن ئەخۆم .

ڕاسی وتووە گۆشتی بۆ بیەن     با ئەوان سەنگەرێوە چۆڵ ئەکەن

نیسە کە ساڵی ١٣٨٩ ی ش ناوو دێی بالک وە بەردێ تا چەم کانی یە چیاوی تا ١٥ چاو بیریان هەیە موتریان لە سەرە نیتر کانی و ناوی تەبیعی وناوی جۆگە کەم بووە . لە برانبەر ناودێی بالک و لای خۆرئاواوۆ قەبرەسانێ هـەیـە بـە نـاو شـێخ برایم کە ئەو شانە سەرەکەوی تا پشت هە سەن بە تاق ئەوە شەخسی گەڕەکی ژورۆ وە زۆرتر غەریب و بێ کەس لەویا ئەنێن کە قەبری ناسان ئەکنیە .

با بزانین شێخ برایم کێ بووە کوڕی شێخ مارف بووە بە منالـی لـە عـومری ١٥ ساڵیدا فەوتی کردووە لەویا ناویانە شێخ مارف لە ساداتی ئەسکۆڵ و پیرانـە کـە تەڕاتەوەئین سێ کوڕی تری بووە ١ - شێخ عارف کە سوادێ باشی بووە وە ماڵی لە دەرزیان بووە بـەگـزادە خۆشـیان ویـستووە زەوی وزار زۆریـان خـستووەتـە ئیختیاری خودموختار بووە لە دەرزیانا دوو کوڕی بوو شێخ عابد و شێخ رەئوف ٢- شێخ سەعید زۆر پیاوی ساڵح بوو زۆر چاوی تیژ بوو مازو چن بوو . لەو هەردە لـە نیوەڕۆدا کە لە سێبەری دارا ڕانەکشا هەسـیرەی چـاو ئـەکـرد سـێ کچـی بـوو دوانیانی دا بە مەلا . کوڕێکی هەیە مەلا شێخ ئەمین وا لە دار سێران . ٣ - شـێخ ئەحمەد سەوادی قورئان خوێندن و نوشتە نوسینی بوو دەنگی خۆش بـوو بانـگ وێژ و موتەرجیم جومعەی بالک بوو . سێ کوڕی بوو( شـێخ موحـەممـەد ، شـێخ ساڵح ، شێخ عەبدوالله) شێخ مارفیش بانگ وێژ مزگەوت بالک بـوو وە دەنگـی بەرز و خۆش بووە . بانگی عەسری داوە بالکییە لە پشت کاڵۆ گوێی لـێ بـووە و

گوتویەتی وا شێخ مارف بانگی دا . لە خۆر ئاوای شێخ برایما شیوێ هەیە بە ناوو شیو سڵە جۆ کانییەکی هەیە لەویا عەبە ڕەشە باخێکی داناوە . پیاوێ موسایی بە ناو سولەیمان ماڵی لە نێ بوو بۆ سەردان قەومە نۆ موسوڵمانەکانی هات بۆ بالک لە دەوریساڵی ١٣١٥ یەکێ لەو قەومانیە میرزا ئەحمەد بوو . دو کوڕی بوو حاجی موحەممەد و مەجید یەکێتریان میرزا عەبدواللە بوو دو کوڕی بو ئەمین و جافر سولەیمان لە ناو ئەو قەومانیا عومری تەواو بوو . من لە بیرمە لەو شیوە سڵەدا ئایان . لەو دیو شیوە سڵەوۆ شیو حەمەی زۆراوە کە ئەو خێڵە زەوی باخیان لەویا هەیە لەو دیو ئەو شیوۆ باخی هەسەن بە تاقە کارێزێکی قەدیمی هەیە زۆر چاوانەی هەیە کەس نازانێ هین چە ساڵێکە بە زەحمەتی زۆر ئەو کارێزە لێ دراوە نیسە وا بە دەس برزون بەگۆ گوێزەو هەنجیرەو هەنگوڕە و تەڕەکاڵییە . برزون بەگ زۆر بایەخ نەدا بەو باخە زەحمەت نە کێشێ و سەمەری زۆری لێ پەیا نەکا . ئاوێتر لە لای باخی هەسەن بەتاقا هەیە وا لە لای ژورۆ وە بەو شیو هەسەن بە تاقا سەرکەوی بۆ ملەکەی لەنجاوا ئەو بەرەو بەر ئەو شیوە دارسانە زوو گەڵا جار بووە پێجگە لەو دوو کانی هەسەن بە تاقە بۆ شوان و حەیوان و هەردەوان ئاوی کانی مێوەکەهەیە لە بەرانبەر هەسەن بە تاقۆ گردە ڕوتە ئەسحابێ وا بە سەر ئەو گردۆو حەیفێ ناونیشانی نازانین لەو گردە ڕوتۆ بەو تیرەشانا سەرکەوی تا ملەی لەنجاواو بەر چەمی قەڵاخۆرئاوای خاکی مەلا قوتبییە خۆرهەڵاتی خاکی بالکە،لای خۆرئاوای بالک و لە بەر هەسەن بە تاقۆ ڕێگەیە ئەڕوا بۆ بەرقەڵا . لای ڕاسۆ گردەڕوتە لای چەپۆ گرد خاتو عاسیە بوو کە هەردووگردەکە چوار دەوریان دارسانە . خاتون عاسیە ژنێ عاقڵ و ماقوڵ بووە لەو شێخان چاوگەیە کە بە بوکی هانیویانە بۆ بالک بۆ حاجی زەهیر . ئەو گردیە پێشکەش کردووە . لە بەین ئەو دوو گردۆ ئەڕۆی بۆ بەرقەڵاهەموی دارسانە لای ڕاس و چەپۆ . بە داخۆ بازێ لەو دارسانە ڕیشەکەن کراوە بۆ زەویوو باخ وە ئەو ڕێگە ئەڕوا لە لای چەپۆ لای گرد خاتو عاسیە یۆ لە باخو بەفرە بە چاڵەکەی کوڕان میرزا سەعی یۆ ئەڕوا تا دار گزگلەکە تا باخەکەی ئەمین سۆفی کەریم تا

هێلانه کۆلاره تا داره ووشکەی ژوورۆ وله لای ڕاسۆ ئەڕۆن تا ئەگا بە هەوار کەرەم وە تا ئەگا بە شیوو فەرهاد بازێکی لێ کراوە بە زەوی بەرەو ژور ئەڕوا تا شەخسەکەی مەلا قوتبی. شیوو فەرهاد لای چەپۆ زەوی پشت کاتیەکەی داره‌ووشکەیە . کە لەویا قەبرێ هەیە ئەڵێن لە گراتیەکەدا نەفەرێ ڕێبواری غەریب لەویا لە برسا مردووە وە هەر لەویا ئەسپەردە کراوە . نەفەرێ بەد تەشک و بێ گوێ لە بالکا بوو بە ناوفەجە گالێنە لە دەوری ساڵی( ١٣١٦ ش) دا ئەڕوا بۆ لای سەی عەتای چەتە کە بێ بە چەتە ئەڵێ تا کەتێ ئەکەیت وە شوێن خۆت پیس ئەکەی کە ئەتوانی بچیتۆ بۆ ئێران وەرت ناگرم ئەویش یەتۆ لە خوار شیوو فەرهادۆ لە بەین خاکی مەلا قوتبی و داره ووشکەداله دەوەنێکا دائەنیشێ تازە تاریک ئەکا سێ سوار یەنە بەردەسی دوو بالکی ( حەبیبەالله بەگ کوڕی حاجی زەهیر فایەق‌مەحموود بەگ ، حاجی مەلا ئەحمەد بەرقەڵایی) فەجە گالێنە تەقەیان لێ ئەکات فایەق بەگ و ماینەکەی حەبیبالله بەگ ئەکوژێ . حەبیبەالله بەگ هاتۆ بۆ بالکو خەبەری هێناوۆ هەر بەو شەوە جەنازەکەی فایەق بەگیان هانیۆ بەیانی لە لای ئەلی بەگ مامەیا کە شەهیدی ساڵی ڕوسەکە بوو نایان . بوون بە دوو شەهید . فەجە گالێنە ئەڕواتۆ بۆ لای سەی عەتای کەل وە ئەڵێ : کەتێ وام کردووە فایەق مەحموو بەگم کوشتووە لە بالک . سەی عەتا ئەڵێ : کوڕ مەحموو بەگت کوشتووە کە ڕفێق و خۆشەویسی من بوو لە ئەمنیەگەری‌دا ، سەی عەتا دەسوور ئەدا کە فەجە لە سورێنۆ بخەنە خوارۆ وە نیسەش پێشەکانی وا بەو هەردو بەردۆ، فەجە تاقە خوشکێکی بوو بە ناو عەلەمەگیری . نیسە بەو شوێنە ئەڵێن فایەق بەگ کوژیاوو . لە کلکەکەی خەزێنەکەی بالکۆ ڕوو بە خۆرئاوا ڕێگەیە ئەڕوا تا نزارە چیەڕ تا داره ووشکەی خوارۆ بازێکی نزیکی ناودێی بالکە زەوی و کانی لە ژور ڕێوۆ هەیە بە ناو کانی چەقالە کە بۆ شوان و دەشتەوان ئەو دەورو پشتە باشە بازێکتری کە نزیکی داره‌ووشکەیە هەردوو دارسانە ئەو ڕێگە کە لەو دارسانە ڕەد ئەبی ئەڕوا بۆ جوجە سازی و ڕیخەڵان . (هۆردوویەکی زۆری ئێران لە کلکەی خەزێنەکەی بالکا چادریان هەڵ دابوو لە ٢٥ی ڕەشەمەی ١٣٦٦

ش لە شەڕی ئیران و عێراقا تەییارەی سەددام حەملەی هەوایی پێ کـردن دوو ماڵ ئاوارەی بالک لەوو نزیکا ماڵیان بوو بەر ئەو حەملە هەوایی سەددام کەوتن . ماڵێکیان بە ناو عەلی جان کە بالکی بوو بە ماڵۆ ڕۆیی بوو بۆ مەریوان بە ئاوارەیی هاتبوۆ بۆ بالک ژنەکەی بە ناو بەهیە کە کچ حەمە خواموراد بوو لە شێخە کوێـرە . خۆیو ژنەکەی وە چوار کوڕی شەهید بوون . کوڕو کچێکی منالیان لە ماڵا نەبوون دەرچوون، دایکی دایکیان بە ناوو توبا بالکی لە شێخەکوێرە بەخێوی کردن . ئەبێ ئیسە ساحێو ماڵو منالْ خۆیان بن . یەکێتریان بە ناو ڕەحیمە قوتـو کـە جگـەرە خۆرێ قابل بوو لە دۆڵە بیوۆ بە ئاوارەیی هاتبو بۆ بالک ژنە کـەی بـە نـاو پـەری خوشکی مەجید حەمە سەعی بەرقەلاّ یی بو خۆیو ژنەکەیـو دوو کـوڕی شـەهید بوون دوو کوڕیان لە ماڵۆ نەبوون دەرچوون . بە پاڵ یەکۆ وەک جۆگەلە لە شـێخ برایم قەبریان بۆ کەندن وە بە ڕیز بە خاکیان سپاردن خوا بیان بەخشێ ، کە لـە ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٦ دا ڕوی دا . وە بۆمان مەعلـووم نـەبـو کـە تـەلـەفـات هۆردووەکە چەنێ بوو وە چۆن بوو ە . وە زۆر بالکی لەو حەملەدا شیمیایی بوو ن . لە وەخت ئەو حەملەدا من لە سەر بانی حەوزەکەی بالک بووم . بۆمی ئەو تەیـارە دای لە چنارێ لە پاڵ پەڵکەکەدا دارانیۆ ناو چەمەکە بە هوژمی ئەوتەیارەو چنـارە کەوتم بە عەرزا ئازا هەڵسام و ڕام کرد بوحەوزە کە کە هێشتا ئالودە نەبوبو سەرو ڕوم شۆری زۆر باش بووم وەلێ هەناسەم ئیستەش نەهاتوەتۆ جـێی خـۆی هـەر خەفەم . ئەو بۆمە نەکەوتایەتە ئەو چەمە زەرەری ماڵی و گیانی زۆرتری ئەبـو بـۆ بالکی ، ئەو چنارە ئەو ئەبەرز بو ئەمانووت : بەربەرەکانێ ئەکا لە گەڵ پەڵکەکەد ا ( لە قەزای شەهریوەرا ساڵی ١٣٢٠ ش ئەو هەمو سەربـاز و مـەئمـورە کـە لـە مەریوانا بوون ئەسرەتیان ئەمابوو . کونە مشکیان لێ بوو بو بە عـەمـارەت ڕو بـە سەوڵاوا ڕوو بە ئەو جادەی بەر بالکا هاتن لە زەوی مزگەوتی لا ئاشا نـەحـمـەدی نادری بالکی ناوی گاڵی ئەیەرا لە ترسی ئەو هۆردووە لە پـشت ڕێـوۆ بـە پـای پەتی و قوڕاوی بە بێڵەکەیۆچوبوە ناو دەوەنێ یەکێ ناحاڵـی و بـێ ئینـساف لـەو هۆردووە ئەڕوا بە لایاو ئەیکوژی و بە جێی ئەهێڵێ ) لەو بـەر پـردی جـادەکـەی

مەریوانۆ لە بەین خاکی بالک چەناخ چیانا هۆردووەکە دیلی چەتەیان بە دەسۆ ئەبێ بە ناو ڕەحیم وەلی گوێزەکوێرەیی بوو، کوشتیانو بەجێیان هێشت . بالکی هەردوو جەنازەکەیان هانیوۆو بۆ بالک لە شەخسی پیرموحەممەدا بە خاکیان سەپاردن . خودا بیا ن بەخشێ . هۆردوەکە لە خاک بالک ونژمارا بە بێوەی دەرچوون کە گەیینە سەر خاکی مرگ تەقەیان لێ کردن تا چۆڕ و نەنە و ئالمانە ڕوتیان کردنۆ . هەمو ئەسڵەحەیان بە دەسۆ نەما . زۆر ئارەزویان بوو سەر خۆیان بۆ دەرچێ . بویان بڕنەوەکەی ئەدا بە نانێ .بویان ئەسڵەحەکەی توڕ ئەدا کە لە کۆڵی کەوێ . بویان ئەیدا بە دوو تمەن کە ئەسرەت نەما هەمو بەڵایە یەت بە سەرتا . من ئەو وەختە ١٥ ساڵ عومرم بوو . ڕەزا شا زۆر بە مل بوو . تا هاتی بوو تورە بوایە لە دانیشتووی شۆراکەی ئەیوت بێ ئەمریم کەن دەسوور ئەدەم دەرگای ئەم تەوێڵەتانە لێ بەسن . کە ئەهاتی هات . کەس نەیزانی چۆن دەرچوو لە وڵات چۆن ئاخری هات .

دنیا هەر وایە دڵ بەستەی مەبە          تۆش هەر وا ئەڕۆی دەربەسی مەبە

بەشی سێهەم لە خاکی بالک خاکی دینارە کە لە شماڵ دینارا ئەو گردی دینارەیە لای پایەگاکە کە ئیسە جوجە سازی‌یە بەو تیژە شانا ئەڕۆی تا کانە قاچکەکە تا دارە ووشکەکەی خوارۆ ئەو جادە کە ئەڕوا بە ناو خاکی دینارا بۆ مەریوان لای ڕاسی دەیمە لای چەپی بەراوە بە دوو ئاو یەکێ کانی دینار دوو ئاوی جۆگە چەم زرێبار خاکی کانی دینار کانیەکی زۆر ئاو داری هەیە کە تەماکۆو تەڕەکاڵی زۆر لە بەریا ئەکرا ئەووەڵ ماڵ کە لە دینارا دروس کراوە چایخانەی سەی کەریم لە دەوری ساڵی ١٣٣٠ یا کە باینچۆیی بوو . کە نۆکەری حەیبەالله بەگ بوو . چایخانەیە کۆماڵیەکی لەویا دروس کرد . بەگزادەکانی بالک لە ساڵی ١٣٣٤ ش ئاشە مەکینەیان هانی بۆ دینار حاجی موحەممەدی خۆش ئەواز و کابرایە ئەسفەهانی دایان مەرزان . شێخ ئەحمەدی باینچویی بو بە ئاشەوانی دوایی ئەو حاجی حەمەومینی عەزیزی بالکی ئاشەوانی بوو . لە ئاخرا دوو دانگی سەند دوای ماوەیە زۆر حاجی حەمە تەبێ چوار دانگی سەند و بردی بۆ ئاوایی بالک لە بالک

نیستەش بازێ وەخت کاری پێ ئەکەن . لە ساڵی ١٣٣٠ش تا نیستە کە ساڵی (١٣٨٩) یە کەم کەم دینار ماڵی زۆر بوو بە تایبەت لە ساڵی ١٣٦٢ دا کە مەریوان ئاوارە بوو هوجومیان هانی تا بو بە شار دینار . خوا خاس کا.( بەشی چوارم لەو زەویانە کە بە دەس بالکی یۆ بو دارەووشکەکەیە ) ئەو ڕێگە لە بەین گردە ڕوتو گردی خاتو عاسیە وۆ ئەڕوا بۆ بەرقەڵا لە دار گزگلەکەوۆ دارسانەکەی تا هێلانەی کۆلارە کە لەوێۆ ڕەد بوی تا شیو فەرهاد خاکی دارە ووشکەیە لە ژورەوە قەبرێ وا لەویا ئەڵێن ساڵی گرانیەکە ئەو ئەفەرە لە برسا لەویا مردووە. لەویانا ناویانە . لە خوار ئەو دۆڵ و چەما کە شماڵی داروشکەیەکارێزێ هەیە بە ناو کانی دارەووشکەکە دەوڵەت لەویا بەو ناوە قومەیە گەورەی بە سیمان و ئاجۆر دروس کردووە . لە زەوی مەحمووی خاڵۆ فەیزە دا بوو . ئاوداتی ڕان و گاگەلی بالک لەوە بەرەو خوار دارەووشکەی خوارۆ وە خۆر هەڵاتی داروشکەی ژوروو وە خواروو خاکی بالکە . خۆرنشینی خاکی مەڵا قوتبییە لەوە ڕێوۆ ئەڕۆی بۆ جوجە سازی .

**بەشی پێنجەم لەو خاکە کەوا بەدەس بالکی یۆ خاکی پاکی مەلاقوتبیە**

چوار دەوری لای ژور و شماڵی ملەی لەنجاوایە بە لای خۆر ئاوادا ئەڕوا گردێ بەرزە تا حەن دۆڵە ووشکە دیو خۆرە تاوی خاکی مەڵا قوتبیە دیو نزاری بەیەڵەیە ، خۆرئاوای مەڵا قوتبی لە دۆڵەووشکەوە یەیتە خوارۆ تا ئەو ڕێگە کە لە بالکۆ ئەڕوا بۆ کانی تووەکەی بەرقەڵا تا دڕک جاڕەکەی لای کانی حەمەی سەی وەیس تا زەویە کان کەنە سورە تا چەم گەورەی زرێبار کە ئەو چەمە جنوبی مەڵا قوتبیە . خۆرهەڵاتی مەڵا قوتبی لە ملەی لەنجاواوۆ ئەو تیرە شانە تا پشت دێکۆنی مەڵا قوتبی تا گردەڕوتە خۆرهەلاتی بالکە خۆر نشینی خاکی مەڵا قوتبیە لە گردە ڕوت بەرەو خوار تا شیو فەراد خۆر هەڵاتی مەڵا قوتبی ژورەوە . وداره ووشکە خۆر هەڵاتی مەڵا قوتبی خوارەوە تا دارە ووشکە تەواو ئەبێ واچوار دەوری مەڵا قوتبیت بو دیاری کرا با بزانین ناوە ڕۆکی چۆنە لە ملەی لەنجاواوۆ یەیتە خوارۆ زەوی و ئاوی عەبەی دەرویش حەمەمینی بالکیە کە

بازێ گوێز و تەڕەکانی لەویا بوو لەوە بەرەوخوار ئـەو شـیوو وچـەمـو دۆڵـە تـا جوجەسازی مەلا قوتبی‌یە . ئەو دێ کۆنە کانییەکەی لە کاریز ئەچێ کە ئـەو دێ بەو ناوە بەڕێ چوون لە دەوری ساڵی ١٣٥٥ شەمـسی یـا حـەمـەی دەرویـش ساڵح بالکی لە زەوی بەر ئەو ئاوا تەماکۆو تەڕەکاڵ و بێسانی ئەکرد من کاڵەکـی زۆرم لێ خواردووە . دەسەیە لە جوجە سازیوێ هاتبون بۆ زیارەت وسـەیـران بـۆ مەلا قوتبی منالیان زەرەر زۆریان دابوو لە تەڕەکاڵ حەمەی ساڵێ لە یەک هـەڵ چووبون شان حەمەیان شکاندبوو . لە کار کەوت ئەو زەویوو زارە پەکی کەوت ، بۆ عیلاجی شانی حەمە چوو بۆ بەغدا بە کۆمەک شێخ عەبدولکەریم کەمـن ئێـشی سرموت دوای ئەوە فەوتی کرد خووا عەفویان کات . ٧٥ ساڵ بەر لـە ئیـسە کـە ساڵی (١٣٨٩) یە پیرەژنێ لە بالکا بوو بە ناو خاتو خانمێ ژنی حەمە بـارام بـەگ بوو ئەیووت : من لەو دێ کۆنی مەلا قوتبیا لە دایک بـووم بـەو قـسەی ئـەوا وا دیارە دێ کۆنی مەلا قوتبی تا ١٥٠ ساڵ بەر لـە ئیـسە کـە سالـی (١٣٨٩) یـە ئاوەدان بو بێ، وا دیارە ئەو دێ کۆنە ناوی تری بوبێ لە بیر چوبێ . لە خـوار ئـەو دێ کۆنۆ قەبرستانی مەلاّ قوتبی‌یە کە قەبری زۆری تیایە لە خوار ئەوۆ قەبرستانی مەلاّ شەمسەدینە قەبری کەمە ئەو دوو قـەبرسـانە زۆرتـر مـەلـا قـوتبی جـێی سەیرانی بەیەڵەو بەرقەلاو ، بالک و لەنجاوا بوون . لە مەریوانیـشۆ زۆر وەخـت ئەهاتن لە پێنجوێنۆ کەم جار ئیسە تەرک بووە بە بۆن ماشینۆ . کانی‌یە لە بەیـن شەخسەکەی مەلاّ قوتبی و مەلاّ شەمسەدینـا بـوو تـا دەور گـەلاوێـژ ووشـکی نەئەکرد لە بەرامبەر شەخسەکەی مە لا قوتبی‌یۆ لەو بەر چەمەکەوۆ کانی‌یە هەیە بۆ زەوی مەلا قوتبی زۆر تا زەویەکەی مامۆسا مەلا باقر کـەوا لـەویـا بـەو ئـاوە ئاوویەریمان کردووە من خۆم زەویەکەم بەو ئاوە ئاویـەریـم کـرد . گرانـی بـوو تەنەکەی دێمیلەم بیا یەوەشان و ە کێلام ١١٠ مەنی تیا بوو دام بە ١١٠ تمەن . لە ئەووەڵی دیوان مە لا موستەفای بێساراتی‌وۆ نوسراوە کە مەلا موستەفا کـوڕی مەلا قوتبە دینی کوڕی مەلا شەمسەدینە لە دێی بێسارانی ژاوەرۆ لە دایک بووە . لە نودشە و لە سنەوو لە پایگەلانا خوێندوویەسی جگە لەوە سەرەتای خوێـندنی

له لای باوکیا دەسی پێ کردووە . زانستە ئیسلامیەکانی تەواو کردووە وە بە مەلایی ژیانی بردووەتە سەر . لە تەمەنی ٦١ ساڵی‌یا ماڵ ئاوایی لە ژیان ئەکات وە لە سەر وەسیەت خۆی لە قەبرسانی پیرە هەژارە بە خاکی ئەسپێرن کە ها لە بەرانبەر سەو ئاواوۆ بە لای مەریوانۆ لە ساڵی ١٠٥٣ قەمەری یا لە دایک بوووە کە بە رانبەری ١٦٤١ زایینی یە لە ساڵی ١١١٣ ق فەوتی کردووە کە بەرانبەرە لە گەڵ ١٧٠٢ زایینی‌دا . لە مانۆ وا دەر دەکەوێکە مەلا شەمسەدینو وە مەلا ئەبوبەکر چۆڕی هاوزەمان بوو بن کە کە لە ساڵی ١٠١٤ ق لە ئاوایی چۆڕ فەوتی کردووە .

٣٩ ساڵ بەر لە دایک بوون مەلا موسەفای بێسارانی کە لە مەریوانا لای زرێبارۆ موجەسەمەیان بۆ دروس کردووە . وا مەشهورە کە مەلا شەمسەدین لە قەبرەکەیا زۆر سالم و ئارامە وە مەلا قوتبەدین زۆر توڕەیە لە گەڵ کەسێکا کە بێ ئەدەبی بکا . ئێمە قوتابی بووین لە دەوروبەری ساڵی ١٣١٦ دا لە گەڵ مامۆساکەمان سوفی ئەحمەدی فەرەج ڕۆیین بۆ سەیران بۆ شەخسەکەی مەلا قوتبی . ڕلوچی یە هات بۆلامان سمۆرەیە بە داری بەرزۆ بوو بڕکەیەکی بۆ خست بڕکەکە گەڕاوۆ و دای لە پیالە و ژێر پیالەیە شکاندی . گشتمان ووتمان ئەمە لە بەر ئەوە بوو کە بێ ئە دەبیمان کرد لە گەڵ ئەم شەخسا . مامۆسا مەلا باقر بالکی ئەیفەرموو پیاوێ بە ناو دەروێش مەحمود قەبری وا لە درگای خسنەکەی مەلا قوتبی دا کە موریدی بووە بە مەجزوبی مردووە ئیستەش لە قەبرەکەیا هەر مەجزوبە . سەی حیسام بەر قەڵا داری گەورەی لە شەخسەکەی مەلا قوتبی بڕی بوو بۆ نی‌ی ئاشەکەی کە لە بەر کانی و تووەکەی بەرقەڵا دا بوو لە دەوری ساڵی ١٣١٨ دا بوو . زەخمێ هات لە ملی وەخت بوو بیخنکێنێ بە ژن و منالۆ خۆی خستە سەر خسنەکەی مەلا قوتبی پاڕاوۆو ووتی غەریبم منالەکانم لە مە ریوانا بێ‌کەسن بمکە بە خاتر ئەم منالانە عەفوم کە . هەر لەویا زەخمەکەی درگا نەکاتۆ ئەجاتی ئەبێ . ئەم سەی حیسامە بە خرەی ئیمام کەوتبو کە دەنگی لە گەڵ ئەنەکرد . لە بەین داروەوشکەی خوارۆ و مەلا قوتبی‌دا گاگەلە ڕێی بالکی ئەچووە خوارۆ بۆ

سەر چەم زرێبار بۆ ئاودان ، ئیسە کە جوجە سازی سووکە شارێکە بەری گرتووە . ئەو ڕێگە کە لە بالکۆ ئەڕوا بۆ کانی تووەکەی بەرقەڵا لەوە بەر چەمەکەی مەڵا قوتبی یۆ مەڵا قوببی خوارۆ وە تا کە ئە سورەی لای چەم زرێبار کانییە وا لەویا بە ناو کانی حەمەی سەی وەیس لای ڕاسۆ جۆگەیەکی لێ هەڵئەگیرا بۆ ئەو زەویانە تا کەنەکە سورە ئەکرا بە تەماکۆ و تەڕەکاڵ . ئەمانە کە نوسیمان لە بارەی مەڵا قوتبی یۆ بە سەرهات و حیکایەتی زوو بو . ئیسە دەوڵەت ئەو بەرنامەیەی پێچاوەتۆ وە زەویەکانی مەڵا قوتبی سەندووە کە ئەیکا بە شەهرەکی سەنعەتی کە ساڵی ١٣٨٩ ش یە .

سەرچەم تەماشای خاکی بالک کەی بۆت دەرئەکەوێ کە هەمو خاکی بالک ناو دیوو ناوداری وە دەشت وە دەری وە دارسانی بۆ ناو خواردنەوەی خۆیان وە حەیوان و شووان ، هەردموان و دەشتەوانیان کەم و کۆڕیەکی نەبووە . وەلێ بە داخۆ ئاوو زەوی برنج کاریان نەبووە کە زوو زۆر بایەخیان پێ ئەدا کە وەسیلەی ماشین نەبوو لە ڕەشتو گیلانۆ برنج بێنێ بۆ مەریوان ، زۆرتر بالکی لە بەهارا وەختی مەرەزە یەک مانگ و دوو مانگ بە گوێرەی دەسەڵات داری و بێ دەسەڵاتی بەیانی ئەڕۆیین بۆ مەرەزە بۆ ئێوارە ئەهاتنۆ ئەڕۆیین بۆ قەڵا و کەڵێن کەوە ژ نێ و کانیساتان بە نیوەکاری لە گەڵ مالیکا کە ئەو ئاوو زەویەی بۆ تەرخان ئەکردن تا پاییز گوخڵی بۆ ئەگرت ئەبوا ئەو کەسە کە مەرەزەی ئەکرد لە بەهارا بە قەی بەنەتووەکەی گەنمی بدایە بەو گۆخڵە بۆ کرێی پاییزیش لە خەرمانەکە چەڵتوکیان پێ ئەدا بە شەریکی مالیک ئەبوا لە کیڵانۆ تا ئاخر خەرمان بە لای ئەو قاڵبۆ بوایە ، ئاودێری کردایە ، پاسی کردایە ، زەرەرو زیانی دەفع کردایە ، ئەو زەویە ئەبوایە بکرایە بە گۆل چیم بە چیم بیان بڕیایە بە بێڵ ناسن چین بە چین داینایە لە عان توو وەشاندنا گوڵ بە گوڵ لەقەشیلیان کردایە ، ڕاساویان کردایە جاتویان پیا وەشاندایە، کوڕی خاس مەگەر جێی دوو کیلوی کیلایە، لە بەر سەختی کارەکانی ناویان نابوو مەروەزە ، وە لێ چون کارەکانی تا درەوو خەرمانی دەسە جەمعی بوو وەکو سەیران وابوو . هەر گاڵتەو گەڤیان ئەکرد

له پاییزا تەماشای خه رمانه مەرەزەت کردایه خه رمانه مه رەزەی بالکی قەوی تر بوو ، برنج مەریوان له هەموو برنجێ خۆشتر و به لەزەتتر بوو . من خۆم لـەو خـه رمانانه بەشدار بووم ، میللەتی بالک زۆر زەحمەت کێش و سەخـاواتـدار بـوون . هەرچێکیان بوو له گەڵ فەقێ ۆ مەلا و میوانی ئەو مزگەوتا بە یەکۆ نەیانخوارد ، وە بە تێکەڵی مەلا و فەقێ عه قڵ و شوعوریان له خەڵک جیاوازتر بووە .

به بەگ و بۆر و شێخ و مـــەلاوۆ　　　ولن به سەر سفرەی ڕەنگین فەلاوۆ

دۆعایان بۆ کەین خوا بێوەییان کا　　　بـــۆ هـــەمو کارێ ماتڵیان نـــەکا

دانیشتووی بالک له هەمو زەمانێکا حه زیان کردووه به ئـاۆو دانـی خاکیـان . لـه خاکی بالکا حەوت کارێزیان لێ داوه ١- کانی دەرویـّش حـەمـه لـه ژور بـاخی چەمەنەکەوەیە ٢- کانی قەیخا ووسەیێ که گەڕەکی ژورۆیی بالک لەوێ ئاویـان ئەهاورد وه باخچەو دیبەر زۆر له بەریا بوو ٣- کانی حەوزەکه که چاوانەکـانی ڕوو به مزگەوتو ئاوایی ئەڕوا ٤- کانی خوارۆ که چاوانەکانی ئه ڕۆی بۆ ژێرماڵ حـاجی زەهیر تا بەر گردی خاتو عاسیه ٥- کانی ئاو هەسێرەکەی پاڵ ئاو دێی بالک کـه ئوقمه لەو هه سێرا که دەوڵەت دروسی کردووه ٦ – کانی هەسـەن بـه تـاق کـه دەهەنەیەکی دورو درێژی هەیه وادیاره ئەم کارێزەی ٥ و ٦ له زەمانێکا بووبن که کەس نازانێ کێ لێی داونو کەی لـێ درلوون ٧- کـانی دارەووشـکه کـه زۆر بـه زەحمەت ئەم کارێزانه لێ دراوون وه بالکی بەو ئاوانه بـه ڕێ چـوون کـه ژیـانی هەموو گیان دارێ و دەوامی بەو ئاوه . بۆ نمونـه دڵ فراوانـی و باشـی بـالکی لـه بیرەوەری منا پێنج ئه فەر فەقیری پیری بێ ژن ومناڵ لەو مزگەوتی بالکا ژیـاوون تا مردوون . ١ – مامه حەمه شەریف دوای چەن ساڵ لەو مزگەوتا بوو لـه ساڵـی ١٣١٥ ش فەوتی کرد . ٢- سۆفی ئەلی که سۆفی خەلیفه ئەحمەدی بالـک بـووه له گەڵ بالکی قەوم بوو چەن ساڵ لەو مزگەوتا ژیا بۆ دیدەنی ئەحمـەدی کـوڕی ڕۆیی بۆ پێله زۆری پێ ئەچوو لەوێ فـەوتـی کـرد . ٣- پیـاوێ بـێ کـەس لـه وولەژێرۆ به ئەخۆشینۆ هات بۆ بالک دوای ساڵێ لەو مزگەوتا فـەوتـی کـرد ٤- سۆفی ئەحمەدی فه رەج که باوکی یەکه دەوڵەمـەنـی بالـک بـووه تـا مـردووه

سەروەتەکەیشی تیا چووە . سۆفی ئەحمە د مامۆسای قوتابی بوو تـا کـو حـەوت ساڵ لەو مزگەوتا بووە لە ساڵی ( ١٣٦٨) ش فەوتی کرد ٥- حەمە ڕەحیمـە بـۆە کە دایکی بە هێلکە برژاوو بەخێوی کردبوو لە مزگەوتە کەی بالکا دوای پێنج ساڵ فەوتی کرد . (داری دارسانی مەریوان وەکو بالک زۆرتری مازوارو بەڕوارە ) ئـەم دوو دارە لە هەمو دارێ بە کە ئکترن بۆ سووتان و داری خانوو زووتر بەم دووانـە ماڵیان درووس ئەکرد بە کۆڵەکە و نیرگەو دەسەک و گورگەو خێزەرو گەڵا خانوو ، هەر لە مانە دەرگایان بۆ دروس کردووە بەینی دیوو گەورەیـان بـە تـەیمـان بـۆ دروس کرد بوو بۆ ئەوە کە هەڵم و بۆ قیان چن بە یەکا بـۆ لابردنـی سـەرمـای زمسان وە بۆ ڕۆشنایی ئاور. وە بێجگە لەمانە داری بەڕوو ، بەڕوەکـەی باشـترین دەوایە بۆ زەخم مەعیدە ، داری مازوو جگە لە دارو گەڵاکەی ٨ سەمـەری هـەیـە بەم جۆرە :

گەزۆیەو مازو سیچکە و خڕنوکە گزگلەو پانکەشووکە و دەموکە

و ئەمانە موشتەریان بوو ئەیان سەندن گۆشتیان ئە دا بە سیچکە ، من مناڵ بووم جارێ ڕۆییم بۆ لای دارە گزگلەکە ئەوو ناو دار بالکە دوو کیلۆ سیچکم هـانی دام بە دوو کیلۆ گۆشت سەر بەسەر .

دارسانی مەریوان کەمتر ئەم دارانەی هەیـە ١- هـەرمـن کـیفیلە ٢- گـۆیـێژ ٣- بلاڵوک ٤-قەسوان ئەم چوارە داری سەمەرن ٥- شەهـین ، بـن کـەڵـکە ٦ - کیکف ، کەوچک و تەشی و شانە و مەزراحیان لێ درووس ئەکـرد ٧ - پـەڵـک ، نێرگەو دەسەکی زۆر چاکی لێ ڕێ ئەکەوت وە بۆ نـەجـجـاریو درگـاو دەروازە زۆر باش بوو ٨ - ووزم ، دارێ کەمیابە لە بالکا لە دوو شوێندا هەیە ، وە چنارو بی کە داری ئاوین لە دەور ئاوایی بالک بەو چەما بەرەو خوار تا چەم گەورەی زرێبار تـا دینارو جوجەسازی بی و چناری زۆرە . هەورامی یە چاوی کەوتبو بەو هەمو بییە لە بالکا ووتبوی : ئەم هەموو بییە دار گوێز بوایە دوو دێ وەک بالکی بەخێو ئەکـرد .

٩ - گوێز کە لە باتی پەییون بە گوێزا ئەوە بە قەوە تێ ئەکەن ١٠ - دار چوالەو و بادامە لە بالکا کەمە ١١- گەوون کەتیرە کەمینەی عە زەی مـە رجـان لـە بالکـا

کەتیرەی ئەکرد . یەکێتر لەو دار دارسانی مەریوانە وێووڵە لە دار بەڕوار شەنگ و شۆخترە لە سەردۆشۆ لای بادەڵان لە بەینی ئێران و عێراقا هەیە من دیومە .
فارسێ پرسی لە کوردێ چۆن گەزۆتان بۆ بەرهەم یەت بە فارسیە کیفیلەکەی خۆی جوابی داوەو ووتی : بە تەوراسێ تیژونده ، لقە لقە بڕونـده ، مـەلـۆ مـەلـۆ کوننده ، لە سەر مەوجێ پانونده ،بە دوو لقی کوتونده ، بە بێژنگێ تەقونـده ، گـە زونده هەی گەزونده .
حەیوان هەردی مەریوان و بالک کەو ، کەروێشک ، ڕێوی ، گورگ ، خـوگ ، کـە ڕاویان ئەکردن بۆ چی . خوگ زەرەری زۆرە بۆ کشت و کاڵ ، بە سەوزی هـەڵـی ئەگێڕاوۆ بۆ سەلکە پیازە خوگانە ئەگەڕا کە بیخوا ، کـە خـەڵـە پـێ ئـەگـەیـی ئەیخوارد خوگە پاسی گەڕەک بوو ، گورگ حەیوانی ڕانی ئەخوارد ، مەڕێکمان بو لە ئەچێ سەرتەقەی ڕان بوو لە دڵم دەر ناچێ کە گورگ خواردی .
ووتەی پێشینیانە : هەر ڕۆژێ هەورە گورگ دەمی چەورە ، لە من هاتە دی ، کـەوو کەروێشکیان ڕاوو ئەکرد بۆ گۆشتەکەیان کە زۆر ناسک و لەزیزە . ئـەیـان ووت گۆشتی کەروێشک زۆر بە بەرەکەتە کەروێشکێ ووتویەتی : کەیبـانو دزیـم لـێ نەکا بەشی خێڵێ ئەکەم ، ڕێویش گۆشتیان ئەخوارد وە زۆر ڕەش و ڕەگ ڕەگ و ناخۆشە

ڕایـە خواردومە هـــەر پــەشیمانم ڕایە تر نایخۆم تا ماوە گیانم
ڕێوی گۆشت خۆرە گۆشتی ناخورێ لە دڵتا مەیکە بە کۆسپ و گرێ

کیسەڵیش زەرەری بۆ زەرعات زۆرە، ژێر پێی ئەکا ئەیخوا ، بە تایبەت نـۆک کـە تە ڕو سوێرە ، پیاوێ ئەچێ یی پەڵەیە نۆکی چاکی بوو ، کیسەڵ تێی بەر بو بـون ئەویش دوو سەوەتەی نایە سەر پشت کەرێ و ، کیـسەڵـەکـانی تـێ خـستن و بردنی بۆ چەم سەقەتاو کە لەوێ تێر ناو بخۆنۆ ، لە دو ئەمنیە چاویـان کردبـو بـە غار تە پیان دابوە سەری وایان زانی بو کە بارە قاچاخی یە کە چاویان کەوتبو بـە کیسەڵەکان زۆر تەریقی‌یان پێ کێشا بو .کەم کەم ئەو کیسەڵـانە هـاتبو نـۆ بـۆ

زەویەکە کە وەتەن بوو . کەمتری خاکی مەریـوان و بالـک سـمورەو چالـەکـە و ژیژگیان هەیە .
حەیوانی بە کە ڵک بۆ مەریوان و بالک ئەمانە بوون . گا ، بزن ، مەڕ ماین ، هێسر ، کەر ، کە زۆر بە قیمەت بوون و خزمەتیان ئەکردن

کاروانی لە بەر مەسڵەحەتی خۆی ئەڵێ باوکەکەم بە کەرەکەی خۆی
باتوێش هەر وەها زووانت خۆش بێ کار و فـــرمانت با لـــە پێشۆ بـێ

ئەمانە زۆر بە خێر و بێر بوون بۆ لادێ وە کۆمەکی کاری گەورەی جوتیار بوون ، وە بەمانە دەوڵەمەن ئەبوون ، وە کارو باریان بە ڕێوۆ ئەچو ، مریشک زۆر بە کەڵـک بوو ئاسان بە خێو ئەبو، حازر بە دە س بوو بۆ هێلکە وە بۆ گۆشتەکەی ، بـۆمـاڵ و مناڵ و خێزان و میوان ، بۆیە ووتویانە : ماڵ مری زو مەکری ، پشیلەیش لـە مـاڵا زۆر باش بو بۆ سەرکوت کردنی مشک ، وە سەگ بۆ ڕاوو پاس ، سـەگ لـە بـەر چی نەونە بە شەوا ئەوەڕی لە ترسی گورگ کە هەر لەزوو وۆ دوژمنن بە یەک .
بۆ بەیانی قازانجی بە خێو کردنی حەیوان ئەم دوو شێعرەم نووسی

ماس و کەرەو ڕۆن ، پەنیر لە گە ڵ شیر سیراج و کەڕەو دۆو فرۆو سەرشیر
تا ئـەم دە دانە بـــەهرەی حــەیوانە خزمـــە تیان بـکە مـەگرە بـەهانە

بێجگە لەمانە لە بەرگی حەیوان ئەمانە درووس ئەبون : لە خوری مەڕ بەڕ و هۆڕۆ جاجم و مەوج و بەرماڵ و خوێ دانە و گۆرەوی و شاڵینەی کۆڵ ژن و دەس کێش و پوزەوانە و شاڵ مل وپشتوێن و پەرگەمای کڵاشیان درووس دەکرد . لە بەرگـن کاووڕ نەووگ ، لەوەو بەر ڕان بزنە مەرەزەو ڕەشۆکی جیا بوو . کە لە یـەک هـەڵ نەیەن و بەچکەیان تێکەڵ نەبێ . لەو مەرەز بزنە مەرەزە ڕانک و چۆخەی جوانیان درووس ئەکرد .

ڕانک و چۆخەی چاک لە فاسۆن لەندەن باشترە لـــە بۆ سیحەتی بـــەدەن
بــۆ ســـوک و ســـۆڵی بۆ بـــەردەوامی لە هیچ کوی نیە وەک شاڵ هەورامی
بە نووکی تـــەشی ئــەو شاڵە جوانـــە دەس ڕێسی ژنە لەم کـــوردوستانە

هەر ژنێ بــە شوێن ئــەوانا نــەڕۆ بژی هــەر عومری بە فیڕۆ نــەڕۆ
لە مووی بزنە ڕە شۆکی گۆری سو جەواڵ و ڕەشکەیان درووس دەکرد ، ئەوانە کە جووت و گایان بوو لە بالکا ئەبوا بۆ بەرهەم هاتین بەهرە بــە ژن و پیــاوو گــەورەو بچوکۆ خەریک بوایەن ، بێجگە لەوانە سەنعەت کار پیاوانە وژنانە لە بالکا بوو . بو پیاوانە خەیات ، ئەجار ، کەوچک تاش ، کلاش کەر ، کلاش چن .، پیاوێ لە بالکا شوان بوو بە دەم شووانیو کلاشی ئەچنی جوتی بە دوو قران سـپی چـاوو ڕەش ، ٤٢ جووتی لە سالی ١٣١٥ دا چنی بوو بە هەشتاو چوار قران ئافەریــن بــۆ تــۆ .
کەسب و کاری دەسی ژنانە : گۆرەوی و پوزەوانە چنین ، تــەوەن کــردن ، بــەڕو هۆڕلە گەورە مالانا دیومە کردویانە، جاجیم ، پەلاس ، بەر چاوە گرتنەوە ، خەیاتی دەسی ، دەرزی و درومان ، پێسە خۆش کردن ، بۆ مە شکەو هەوانە ، هەوڕ کردن دیزە و دەرخۆنە و هومەو خویدانە و گۆزەو گلێنەو گۆزەلەو قوم قومۆکەو تــەنــور نان کردن و پاشۆر . بە ژن و پیاوۆ هەموو کاری ئەکــرد مــەگــەر شــەل وکوێــر سوالی بکردایە .
بۆچی وەک جاران ئیسە کار ناکەن بەدبــەختــی خۆیــان چــارە ســەر ناکــەن هەر کەسێ کار کا سەری زۆر بــەرزە هــەتــا کــو مــابێ لــە ســەر ئــەم ئــەرزە وە غەیرە فەلاکان بالک خەریکی شووانی و ئاشەوانی و نیوە کاری و کرێ کاری و ئانەوایی کارەکەری نۆکەری و ئەو جۆرە کارانە بوون . بــە ژن و پیــاوۆ کــە ئــەم کارانە پێویستی ژیان بوو.

### باسی حوسەین قولی بەگ و ئەتەوەی لە بالکا

بە جۆرێ من لە ناسرخان کانی سانانم بیستووە کە لە ڕوی نوسراوەیەکۆ کە بــەو شێوە بەیانی ئەکرد ئەسکەنەر بەگ دەرەتفێ بە حــەووت پــشت ئــەچێتۆ ســەر کەلبالێ خان کە مالی لە خەلوزە بووە . قەبریشی وا لەوێ . من چومە سەر قەبری جا هەر پشتێ سی سالی بێ چوو بێ ئەبێ بەینی ئەسکەنەر بــەگ و کــە لبالــی خان ٢١٠ سالێ بوو بێ ئەسکەنەر بەگ شەش کوڕی بووە ١- حەیدەر بەگ کــە باوکی بەگزادەکانی کانی سانان و دەرەتفێو پیرسەفا و لێوو خواروو وە مڕانە بووە

کە هەموویان مەشهورن بە حەیدەر بەگی ٢- فەتالی بەگ کە باوکی بەگ زادەکانی نێ و وولەژێر و سەردۆش و یەنگیجە بووە کە مەشهورن بە فەتالی بەگی. ٣- حەمە کەریم بەگ کە باوکی بەگزادە کانی کانی میران و بە ردەڕەشە و بێلو بووە کە ئەمانە مە شهورن بە حەمە کەریم بەگی . وا ئەزانم حاجی ڕۆسەم بەگ لێوو سەرو کانی میرانی و حەمە کەریم بەگی بووە . ٤-حەمەد بەگ گوێزە کوێرە باوکی بەگزادەکان گوێزە کوێرەیە کە مەشهورن بە حەیدەر بەگی ٥- حەمە ڕەزا بەگ بەیەڵە باوکی بەگ زادەکان بەیەڵە و لەنجاوایە کە مەشهورن بە حەیدەر بەگی ٦- حوسەین قوڵی بەگ کە باوکی بەگ زادەکان بالکە کە مەشهورن بە حەیدەر بەگی ، بە جۆرێ من بیستومە لە ناسر خان کاتی سانان لە ساڵی ١٢٩٠ق دا حوسەین قوڵی بەگ لە براکانی لە دەرەتفێ جیا بووەتۆ هاتووە بۆ بالک کە لە گەڵ بالکی یا بژی، بالکی لەو وەختا ١٢ ماڵ بوون حە زیان کردووە کە دەم ڕاسی وا بێ بە گەورەیان وەکۆمەکیان پێ کردووە ، وە بە دوانزە تمەن بالکی سەندووە ئیتر بالکی دە دوو زەکاتیان پێ داوە ، چە تاخ چیان لە سەر بالک بووە کە عەزیز خان باوک مەحموو خان دزڵی ئەمیە بیستووە کە حوسەین قوڵی بەگ بالکی سەندووە بە ناو دیدەنۆ هاتووە بۆ بالک بۆ لای حوسەین قوڵی بەگ کە نانیان داناوە ووتویەتی : نان ناخۆم تا چەناخ چیانم نەدەیتێ ئەویش ڕوگیر بووە چەناخ چیانی پێ داوە . ئەویش هەردەکەی خستووە تە سەر شارانی و ئاوو زەویەکەی خستووەتە سەر نژمار . سەربەڵخ کێوێکی بەرزە وا لە خۆرهەڵاتی چەناخ چیانۆ قەبرستانێ گەورە لەویا هەیە وا دیارە دێیە گەورە لەویا بوبێ ، زۆر گەڕام بۆ کێلێ نوسراو ئەم دی کێلی ئەخشین بوو نەنوسرا بوو . ئەڵێن پیاوێ جاف هەواری لەویا بووە ووتویەتی بە یەکێ لە ژنەکانی چۆن بەیانی زوو خەبەرتە بێتۆ ئەچی بە لای حەیاونەکانۆ . ژنەکە ووتویەتی : چەناخەکانم کە چیاو نە بێتۆ ئەدا لە گۆتام خەبەرمە بێتۆ بە بۆن ئە وۆ ناو نراوە چە ناخ چیان ، چە ناخ ژێر چەناکەی ژن بووە بە قرانۆ ، کە کڵاوەکەی پێ بەستووەتۆکە دانەکەوێ لە سەری ، وە حوسەین قوڵی بەگ من بزانم کچی نەبووە وەلێ دوو کوڕی بووە :

فەرەج الله بەگ ، کە یخوسرەو بەگ ، کە لە زەمان ڕوسەکەدا سالی ١٣٣٥ق خزمەتی زۆری بە عە سکەری تورکی عوسمانی کردووە وە ئەوانیش لەقەبی زمیر السلطنة یان پێ داوە کە ڕۆیی بۆ حەج ناوی بە حاجی زەهیر دەرچووە . فەرەج الله بەگ بێجگە لە ئەلی بەگ کە ڕوسەکە شەهیدی کرد و باسی ئەکەین چوار کوڕی بووە بەم تەرتیبە : ئەحمە د بەگ ، مەحموود بەگ ، ڕۆسەم بەگ ڕەحمان بەگ ، هەمویان لە زیندانی قەسری قاجاردا فەوتیان کردووە . ڕەحمان بەگ نەبێ هەمویان کچ و کوڕو نەوەی زۆریان لێ بە جێ ماوە جا من نازانم و ناتوانم بیاننوسم . حاجی زەهیر ٥ کوڕی بووە بەم تەرتیبە : حەمەمین بەگ ، ڕەحمان بەگ ، حەمە کەریم بەگ ، حەبیەالله بەگ) حەمەد بە گ چوار کچی بووە ( خاتو تەلێعا ژن ڕۆسەم بەگ ئامۆزای بووە لە بالک ، خاتو فاتمە ژن حەمەد بەگ ئامۆزازای بووە کوڕی ئەحمەد لە بالک ، خاتو کافیەی دایکی سابیر بەگ پیر سەفا ، وە خاتو پەری نیسا بێ منالّ فەوتی کرد ژن شێخ عارف دەرەناخێ بوو . ئەمانە هەمویان منالو نەوەیان زۆرە لە کوڕو لە کچ ، ڕەحمان بەگ نەبێ کە ژنی نەهانی بوو لە گەلّ باوکی لە قەسری قاجارا لە تاران فەوتیان کرد بە داخۆ نازانم و ناتوانم وەچەی ئەمانە بنووسم .

## مەلاکان بالک

لە مەلا عە بدو الصمد هەجیجی بۆ دەس پێ ئەکەم لە تایفەی مەلاکان هەجیج بووە پیاوێ خۆش سەلیقەو خۆش تەبیعەت و سەخی بووە . وەکو قەوم لە گەلّ بالکی یا ڕەفتاری کردووە . مالّی لە خوار ئاوایی بۆ بووە لای کانی شیرین دارتویە لە حەوشەکەیانا بوو ، ئامۆزای یا برای مەلا حەمەسادق شێخە کوێرە بووە . مامۆستا مەلا عبد الکریم مدرس لە علما ؤنا فی خدمة العلم و الدین بە سەرهاتی نووسیوە بۆ شەش مەلای بالکی منیش بە کوردی و کورتی ئەینوسم . هەر کەس مەیل ئەکا تماشای درێژەی باسەکانی کا . ١- مەلا عبد الصمد هەجیجی لە هەجیج لە دایک بووە ، لە سالّی ١٣٦٠ ق یا بە منالّی دەسی بە خوێندن کردووە وە بە مەدرەسەکانا گەڕاوە تا فێری خوێندن

بووە ، ئیجازەی گرتووە وە لە بالک مەریوانا بووە بە مەلا و مودەڕڕیس بە حورمەتێ زۆرۆ دوای ٣٥ ساڵ مەلایی بالک لە ساڵی ١٣٢٢ ق لە هەجیج فەوتی کرد مەرقەدی وا لە پاڵ کۆسەی هەجیجا . مەلا عبد الصمد لە بالکا ٦ کوڕی نەجیب و بە ئەدەبی بووە. دوانیان عالم بوون لە بالکا مەلاییان نەکردووە مەلا عارف و مەلا عبد الواحد وە دوانیان بەش خۆیان عیلمیان بووە فەلا بوون لە گوێزە کوێرە لەوێ فەوتیان کردووە : مەلا عبدالخالق و میرزا ڕەشید وە دوانیان مامڵە گەر بوون ئەحمەد مەڵا و حەمەمەلا . ئەحمەدیان لە ساڵ ١٣٣٥ ق یا لە غەزای ڕوسەکەدا لە کاکۆ زەکەریا شەهید بووە قەبری وا لە سولتان ئەحمەد ، تەنیا حەمە مەلا قەبری وا لە بالک لە شێخ برایم کە سالی ١٣١٨ فەوتی کرد .

## بە سەرهاتی مەلا عارف بالکی کوڕی مەلا عبدالصمد

لە دەوری ساڵی ١٢٩٠ ش لە بالک لە دایک بووە وە دوای ئەوە کە خۆی ناسیوە لە بالک لای باوکی دە سی بە خوێندن قورئان وە کتێبە چکۆلە سەرەتاییەکان کردووە . دوایی دەسی بە خوێندنی شەرع و عیلمە عەرەبیەکان کردووە دەوامی کردووە لە سەریان وە بە مەدرەسەکانا گەڕاوە تا بووە بە مەلا ، دەنگ و ڕەنگ و خەتی خۆش بووە ، ڕۆیوە بۆ دوڕۆ بووە بە کاتیب وە ئیمامو سەرخەتم خانەقای شێخ عەلائەدین ، وە لە پێنجوێن لای مەلا عبدالرحمان ئیجازەی وەرگرتووە وە بەپێێ بووە بە مەلای یەنگیجە زوو هاتوەتۆ بۆ دوڕۆ لە ساڵی ١٣٣٦ ق دوای شەڕ ڕوسەکە کە خانەقا مودەڕڕیسی نە بووە شێخی عەلائەدین مەلا عارفی کردووە بە مودەڕڕیس مەدرەسەی دوڕۆ ، مامۆستا مەلا کەریم مودەڕڕیسی بیبارە فەرمویەتی : من لە وەختا لە خزمەتیا کتێبی سیوتیم ئەخوێند زۆر قسەی خۆشی بۆ نە کردین . لەم ساڵی ١٢٩٠ ش کە ساڵی لە دایک بوونی مەلا عارفە بۆمان دە رئەکەوێ کە زیاتر لە ١٤٢ ساڵە بالک مەدرەسەی دینی وفەقێ و مەلای باشی تیا بووە کە ئیسە ساڵی ١٣٨٩ شەمسییە .

## به سەرهاتی مەلا عبدالواحدی بالکی کوڕی مەلا عبدالصمد

له ساڵی ١٣٠٢ قەمەریدا له بالک له دایک بووه ، وه لای باوکی له بالک قورئـان وکتیبه سه رەتاییەکانی خوێندووه وه به مەدەرەسەکاندا گـەڕاوه بـۆ فـێر بـوون ، دوای ئەوه چووه بۆ بیارەی شەریفه بۆ خزمەتی مەلا عبدالقاردی گەوره تـا لـەوێ ئیجازەی وەرگرتووه ، مامۆستا عیدالکریمی مدرس بیاره فەرمویەتی مامۆسا مـەلا عبدالواحد حەقی باوکی به سەر منۆ هەیه که فێر خوێندن و ئەدەبی کـوردووم وه چاودێری باشی کردووم له گەڵ باوکم دۆسی ڕاسته قینه ی دینییان بووه . وه لـه دەوروبەری ساڵی ١٣٥٢ ق له ساوجی فەوتی کردووه وه حاجی مەلا ئـەحمـەدی کوڕی بو به جێگەدار باوکی . وەکو من بزانم لەم دێیانا مەلای کردووه وولەژێـر ، کڵەوێنجه ، گوێزه کوێره ، هەرگینه ، هەرگینه و ساوجی وه مەلا حه یدەر ئەوێهەنگـی لـه کەڵەوێنجه سەرف و نەحوی لای ئەو خوێندووه وه له ئاخر کتیبه ده سنوسەکانیا نووسیویەتی به داخۆ تەئریخەکەم یادداشت نەکرد .

## به سەرهاتی دوهەم مەلا و مودەڕیسی بالک

مەلا موحەممەدی مه ریـوانی‌یـه کـه کـوڕی مـەلا شـێخ قـادری کـوڕی مـەلا مەحموودی ئەچن یی بووه ، مەلا شێخ قادر خەلیفـەی حـاجی کـاک ئـەحمـەدی سلێمانی بووه بۆیه پێیان ووتووه شێخ . مەلا شێخ قادر له ڕه شەدێ مەلا بـووه ، وه مەلا موحەممەدی کوڕی لەوێ له دایک بـووه لـه دەورو بـەری ساڵـی ١٣٠٢ قەمەریا له دوای ئەوه که خۆی ناسیوه دەسی کردووه به خوێندنی عیلمی سـەرف و نەحو وه به مه درەسەکانا گـەڕاوه تـا لـه ئـاخر خوێـندنیا لـه پـێنجوێن لای مامۆستای گەوره مامۆستا عبدالرحمان ئیجازەی وەرگرتـووه وه بـووه بـەمـەلای بەیەڵە، زۆر تێکۆشاوه تا ناوبانگی دەرکردووه به مامۆسایەکی زۆر چاک ، کـه لـه بەیەڵە باری کردووه بووه به مەلا و مودەریس بالک فەقـێی زیـرەک و زۆر چـاک دەوریان لێ داوه وەکو شێخ عەزیـز دۆڵـپەمـویی ، مـەلا بورهـانی کـوڕی مـەلا عبداللەی موفتی شاری سنه ، مامۆستا له علماونا دا به سەرهاتی بـۆ مـەلا شـێخ عەزیز نوسیوه . مەلا موحەممەد مەریوانی دوای فەوتی مـه لا عبـد الـــصمـدی

هەجیجی پێنج ساڵ مەلای بالک بووە دوای ئەوە بە دەعوەتی شێخ عەلائـەدیـن بووە بە مودەڕیس دوڕووە ، لە ئاخر عومریا بووە بە مەلای ڕەزاوو لەوێ لە بەهاری ١٣٣٦ قەمەریا فەوتی کردووە . مەرقەدی وا لەوێ ، دوو کـوڕی بـووە مـەلا ئـە سعەد ، مەلا سەعید کە مەلای ڕەشەدێ بووە ، مەلا و مودەڕیسێ چاک بووە ، لای مامۆسا مەلا مەحمودی جوانرودی لـە دە ڕەتفـێ ئیجـازەی وەرگرتبـوو خـوا لـە هەمویان خۆش بێ

## سێهەمین مەلا و مودەڕیسی بالک

مەلا مەحموودی جوانرۆیی بووە کە لـە دەور و بـەری سالـی ١٢٦٣ق لـە دەوری ساڵی جوانڕۆ لە دایک بووە بە سەعی زۆر دەرسی خوێندووە وە کۆششی باشی لە کەسبی عیلما کردووە ، خەتی خۆش بووە ، ئینشای جوانی دانـاوە وە زۆر فارسـی زان بووە بە تایبەت دیوانی کەلیم ، وە موتەخەسیس بووە لە هەمو عیلمی ڕیازیـا لە کەرکوک لای حیکمەت ئەفەندی باش فـێر بـووە ئیجـازەی تـەدریـسی لـێ وەرگرتووە جا بووە بە مەلای بالک لە مەریوان ، دوای ئەوە کە مەلا موحەممـەدی مەریواتی لە بالکۆ ڕۆیووە بۆ دورووە بووە بە مودەڕیس لە ساڵی ١٣٣١ ق، فەقێی زۆر چاک و ووریا دەوریان لێ داوە وەکو مەلا ئەحمەدی ڕەش کە لە علمائنا دا بـە سەرهاتی بۆ نوسراوە وە وەکو مەلا عەبدوالکریم بیارە کە هەشت مانگ لـە بالکـا فەقێ بووە کە شرح عقائدی مەلا سەعد و فـەرائـزی شـەرح مـەنهـەجـی لای مامۆستا خوێندووە وە دوای یانزە ساڵ مەلایی بالک لە سالـی ١٣٣١ تـا سالـی ١٣٤٢ بووە بە مەلای ئەسراوا وە لە دووای سێ ساڵ بووە بە مەلای دەرەتفـێ تـا ساڵی ١٣٦٣ ق کە لەوێ فەوتـی کـردووە ، وە سـەد سـاڵ عـومری بـووە خـوا دەرەجاتی عالی بکات . با بـزانین مامۆسـا مـەلا مـەحمـوود لـە بالکـا دوو ژنـی خواستووە ١- فاتمەی خوشکی حەمە ساڵەی حەمەی بـارام بـەگ، دوو کـوڕی بووە مەلا عەلی و مەلا حەسەن، کچێکی بووە حەمیدە ژنی دووهـەمـی ئـەمنـەی فەتالی بەگ بووە ، چوار کوڕی بووە ( فەقێ حەمەومـین ، مـەلا موحـەممـەد کـە مەلایە زۆر چاک بووە ، ئەحمەد ، عەبە ) هەمویان نەتەوەیان زۆرە

## چوارەم لە مەلا و مودەڕڕیسی بالک ماموٚسا مەلا باقر بووە

کە مەشهورە بە مودەررسی کوردستانی ، عـالمێ زۆر گـەورەو پایـە بـەرز بـووە ، کوڕی شێخ حوسەین خانی ئەردەڵانی بووە لە دێـی نـزار گـاوەڕۆ کـە مولـکی خۆیان بووە لە دایک بووە لە ساڵ ١٣١٦ ق لە عومری شەش ساڵیا لـە شـاری سنە دەسی کردووە بە خوێندن کە ماڵیان لـە سـنە بـووە ، بـە حونجـە و سـایە سورەتە بچکۆلەکانی خوێندووە تا سورەتی قورەیش بە سـێ مانـگ ئیتـر خـۆی خوێنوویەتۆ بۆ ماموٚستا تا خەتمی کردووە ، وە کتێبە سەرەتاییەکانی خوێندووە تا دەسی کردووە بە سەرف و نەحو وە باقی عیلمەکان وە دەسی کردووە بە گـەڕان بە مەدرەسەکانا بە شوێن زانیناتا لە شاری سنە لە مزگەوتی مـەولانـا لای مـەلا موحەممەد مەولانا ئیجازەی وەرگرت لە ساڵی ١٣٣٨ ق . وە دوای شـەش سـاڵ مەلایی چۆڕ لە ساڵی ١٣٤٢ ق بە دەعوەت بەگزادەکان بالک بووە بە مودەڕڕیس و ئیمام جومعەو جەماعەت بالک تا ٤٩ ساڵ بە تەوفـیقی زۆر باشـۆ تـەدریـسی کردووە . وە دوای پانزە ساڵ کتێبی دەرسی بە دەسۆ نەگرتووە بۆ دەرس فـەقـێ هەموی لە بەر بووەو وە لە بەر دەرسی پێ ووتوون . ئەبوا ئەو فەقـێ نـەهـات بـۆ بالک فەقێیە چاک بوایە بۆ دەفعی ئیشکال بهاتایە ، کە دەسیان نەکرد بـە دەرس فەقێکە سەر دەرسەکەی دانمەرزان دوایی ماموٚسـتا تـەواوی دەرسـەکـەی بـۆ ڕۆشن ئەکردۆ و بۆی شی ئەکردۆ وە ئیرادو ئیـشکالی لا نـەبـرد ، جـا فـەقێکـە دەرسەکەی ئەخوێندۆ ، وە ئەگەر لە جێیەکا گیری بکردایە ماموٚسا کۆمەکی ئەکرد تا ڕاسی ئەکردۆ ،ماموٚستا مەلاباقر وەک مەلا چاک بوو عابدێ زۆر چـاک بـووە ، ماموٚستا سەی عەتای چۆڕی ئەیفەرموو ڕۆییم بۆ خوێندن بۆ بالک هەتیـو بـوم و قەومی خاتو خەدیجەی حەڕەمی ماموٚستا بووم حەوت سـاڵ لـە ماڵـیانا بـووم ، ئەمدیوە ساتێ لە عیبادەتا نەبێ ، خەوتێ عالیم عیبادەتە ، هەمیشە سەحەر خەبەر بو بۆ عیبادەت

سەحەر شەش یەکی ئاخری شەوە وەختی شەو نوێژە تیایا مەخەوە

بەر لە تولوع لە ماڵۆ نان و چای ئەخوارد بۆ جەماعەت و نوێژی بەیانی لە مزگەوتا حازر بوو ، پێنج فەرزە ویرد و ئەورادی ئەخوێند لە دوای نوێژەکانی ،لە پاییز و زمسانا دوای نوێژ بەیانی تا خۆر ئەکەوت لە گەڵ بالکی خەتم وتەلیلەی ئەکرد .
کە خۆر ئەکەووت لە گەڵ فەقێ دەسیان ئەکرد بە دەرس تا نزیک نیوەڕۆجا تەشریفی ئەبردۆ بۆ ماڵۆ تا نان و چای ئەخوارد ، بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئەهاتۆ بۆ مزگەوت دوای نوێژەکە کەمێ ئیستراحەتی ئەکرد ، جا فەقێ دەسیان ئەکردۆ بە دەرس تا عەسر ،دوای نوێژ عەسر ماموٚسا سەرێکی ئەداوۆ لە ماڵۆ ، بالکی فێر بووبون لەو وەختا بۆ موشکڵات خۆیان ئەهاتن بۆ خزمەتی ، لە بەینی دەرس و عیبادەتیا وە لە ڕۆژانی تەعتیلیا خەریکی نوسینی کتێب و حاشیەو جوابی سوالاتی نزیک و دور بوو . جامع الفتاوی یەکی هەیە کە چاپ بووە . ئەمانیە بە جۆرێ کردبوو بە عادەت بە بۆن شتێکۆ وەکو میوان یا سەفەر عادەتەکەی شێوا بێ ئەخۆشە کەووت تا ئەهاتایەتۆ سەر عادەت خۆشۆ ئەئەبوو .
وەکو ووتراوە :

تەرکی عادەت کەی هۆی ئەخۆشینە  عادەتی خراپ خۆی ئەخوشینە

با ئێمەیش چاولێکەری ئەو کەین . وەکو ئەڵێن :
عادەتی پیاوی گەورەگەورەترین عادەتە

شوێن کەوتنیان بۆ ئێمە سەربەرزی و سەعادەتە

ماموٚسا مەلا باقر دوای فەوتی خۆی دوو خێری ئەبڕاوەی بە جێ هێشتووە . ١ – ئەو هەمو فەقێ کە دەرسی پێ ووتوون وە هەر یەکە لە جێی خویا نا ماموٚستایەکی گەورە بووە و وە دەرسیان دەسا و دەس بەردەوامە تا دونیا تەواو ئەبێ ، و بە سیسەد ئەفەریان ئیجازەی تەدریس داوە . ٢- وە ئەو هەموکتێبە کە داینـاوە وە ئەو هە مو پەڕاوێزە کە لە سەر کتێبی عیلم و حەدیس و شەرع و تەفسیر نوسیویەتی کە ئەگاتە سیسەد دانە . لە دوای ئەوە کە ماموٚستا مەلا باقر شەوی جومعە ١٧ ی دەی ساڵی ١٣٥٠ ش فەوتی کرد پێنج مەلا مەلایی بالکیان کردووە ١ – مەلا عارف کوڕی ماموٚستا مەلا باقر ئەویش دەساڵ مودەڕیس و

ئیمام جومعه و جه‌ماعه‌ت بووه به ته‌وفیقی باشۆ وه حه‌وت فه‌قێی ئجازه داوه ، له شه‌هریوه‌ری سالی ١٣٦١ ش دا باری کردووه بۆ مه‌ریوان ٢- مه‌لا شێخ زاهید فارۆقی کوری مه‌لا شێخ موحه‌ممه‌د بارام ئاوایی که له بالکا موده‌رریس و ئیمام جومعه‌و جه‌ماعه‌ت بوو چوارده سال له سالی ١٣٦١ تا سالی ١٣٧٤وه دوای ئه‌وه‌باری کرد بۆ شاری مه‌ریوان ٣- مه‌لا عه‌لی مۆقه‌دده‌م له سالی ١٣٧٤ تا سالی ١٣٧٧ یانی سێ سال موده‌رریس و ئیمام جومعه‌و جه‌ماعه‌ت بالک بوو ٤ - مه‌لا ساجیدی کوری حاجی مه‌لا ره‌شیدی زه‌له‌که‌ییه زۆر ئیخلاسی خوا لێخۆش بوو مامۆسا مه‌لا باقر بووه هه شت سال موده‌رریس و ئیمام جومعه‌و جه‌ماعه‌تی بالک بووه ٥ - مه‌لا ئه‌مین سیاناوی کوری حه‌مه گرده‌ی سیاناو له موردادی ١٣٨٤ تا ئیسته که سالی ١٣٨٩ به مه‌لا و موده‌رریس و ئیمام جومعه وجه‌ماعه‌تی بالکه و بالکی هه‌ر وه‌کو زوو زۆر گه‌رم و گۆرن بۆ خزمه‌ت مه‌لا و مزگه‌وت وفه‌قێی بالک . وه منیش ئه‌م دۆعایه یان بۆ ئه‌که‌مو ئه‌م تکایانه‌یان لێ ئه‌که‌م

| | |
|---|---|
| خوا ته‌وفیقیان با بۆ خزمه‌ت به دین | فه‌قێکان بالک هه‌م مه‌لا ئه‌مین |
| با خزمه‌ت خه لکی به زایه ئه‌چێ | با خه فه‌تی زۆر به دلما ئه‌چێ |
| خه‌م خۆر بالکیم هه‌ر تاکو ماووم | هه‌تا ئه‌مرمو نه‌قونجێ چاووم |
| خه‌م خۆریان ئه‌مرێ با منیش ئه‌مرم | هه‌ر چه‌ن پیر بووم ئه‌ماوه دوه‌ورم |

## کوژراوه‌کان بالک له‌م ئال و گۆر ئینقلابا

١ – مه‌حموودی حه‌مه سالح به‌گ له ٢٣ ی تیری سالی ١٣٦٤ له کاره‌ساتی ٢٣ی تیرا له به‌ر سه‌دا و سیمای مه‌ریوانا کوژرا

٢- مه‌حموود ره‌زیه‌ی کیانی سالی ١٣٦٤ له بومباران مه‌ریوانا کوژرا

٣- حه‌مه جه‌هان شه‌ریفی سالی ١٣٦٥ که ئیعدامیان کرد له مه‌ریوانا

٤ – ئه‌مین مه‌جیدی کوری میرزا سه‌عید مه‌جید به‌گ له ناو دێی بالکا کوژرا

٥ – ئه‌حمه د قادری کوری حاجی عه‌بدول بالکی قومپاره‌ی ده‌رگیری داخـلی لـه به‌هاری ١٣٥٨ کوشتی ٦ – ئامینه‌ی قادری خوشکی ئه‌حمه‌د هه‌ر له‌م ده‌رگیریـا کوژرا

## مزگه‌وت بالک هه‌ر له‌و شوینه‌دا چوار جار درووس کراوه

هه‌وه‌ڵ جار که مزگه‌وت بالک له زه‌مان مه‌لا عبدالصمدی هه‌جیجیا بووه وا دیاره به‌رله دایک بوونی مه‌لا عارفی کوری مه‌لا عبد الصمد بـوو بـن کـه لـه سالـی ١٢٩٠ ق له بالک له دایک بووه که ماموسا مه‌لا کـه‌ریمـی مـوده‌ڕیـسی بیـاره نوسیویه‌تی له کتیبی علماونا دا، بالکی له‌و وه‌ختا که‌م بوون پیره‌کان بالک ئه‌یـان ووت مزگه‌وته‌که‌ی چکوله‌و تاریک و نزم بووه بو ئه‌و ڕوژه زور بووه ، (دووهه‌م جار تازه کردنه‌وه‌ی مزگه‌وتی بالک) له زه‌مانی ماموسا مه‌لا مه‌حموودی جوانڕوییا بووه ، دوو حوجره‌ی له سه‌ر دالآن مزگه‌وته‌که‌دا بوو بو فه‌قن و ماموسا و موده‌ڕیس ، وه‌سا به‌نای ئه‌و مزگه‌وته وه‌سا ئه‌ولفه‌ای سنه‌یی بووه ، وه دوو حـوجره لـه ژیـر هه‌یوانی مزگه‌وته‌که‌دا بوو بو قوتابی و ماموسای قوتابی ، مه‌لا ئه‌حمه‌دی چاژی که قورئان و فارسی باش ئه‌زانی ماموسای قوتابی بووه له بالکا که له ده‌وری سالـی ١٣٠٨ بووه به مه‌لای کانی کوزه‌له‌ی مه‌ریوان ، کوریکی بوو به ناو حه‌مه هه‌ر دوو کیانم دیوه . ئه‌وانه له قوتابخانه ده‌ر ئه‌چوون پیان ئه‌ووترا میـرزا ، لـه بالکـا زور بوون له به‌گ زاده و غه‌یره به‌گی ، له‌و میرزایانه‌ی بالک ماموسا مـه‌لا سـه‌عیـدی ساوا بووه باوکی ناوی خووا موراد بووه ، له تایفه‌ی مه‌لو شه‌نگولی ، که‌سـیان لـه بالکا نه‌ماوون ، له دوای میرزایی ڕوییوه بو بیاره بووه به فه‌قیی ماموسا مه‌لا که‌ریم تا له‌وێ ئیجازه‌ی وه‌رگرتووه . ماموسا مه‌لا مه‌حموودی جوانڕوییی ئه‌م شیعره‌ی بو ته‌ئریخی ئه‌و مزگه‌وته تازه‌ی بالک نوسیوه .

بهر تأریخش اگر آگه شوی          دار احسـان مـجد کیخسروی

که ئه‌کاته ١٣٣٧ ق . (سیهه‌م جاری تازه کردنه‌وه‌ی مزگه‌وتی بالک) له زه‌مـانی ماموسا باقری بالکا بووه له سالی ١٣٣٣ دا ، وه‌سا و ئه‌جاری ئه‌و مزگه‌وته وه سا

سمایل لەنجاوایی بوو ، کرێی بەنایی و نەجاری ئەو مزگەوتە بەگزادەکانی بالک دایان ، وە کاریگەری ئەهلی ئاوایی بالک بوو وە زۆرتری داری ئێرگەو کۆڵەکە و دە سەکی ئە ئمانەیی و هەڵوژانی دایان ، خوا جەزایان بە خێر بداتۆ ، ئەم جارە هەر دوو حوجرەی مودەڕیس و فەقێی بووە ، ئێتر مەدرەسەی دەوڵەتی هاتە بالک ، قوتابیە قورئانی خوێندایە لە مزگەوتا نەیخوێند . جا مامۆسا مەلاباقری بالک لەو مزگەوتا زۆر فەقێی چاکی پێ گەیاندووە . بۆ نمونە : مامۆسا ئاغە عەتای چۆڕی ، مامۆسا مەلا حەمەومینی کانی سانانی ، مەلا عبدالرحمان سی‌سیری ، مەلا شێخ عیززەدین حوسەینی ، مەلا سەی جەلال برای ، مەلا حەسەن ئەدیب سەقزی ، مەلا موحەممەدی بەداغی و ە حاجی مەلا موحەممەدی عەزیزی ڕەفێق مەلا موحەممەد بەداغی خوا لە هەمویان ڕازی بێ .
پێنج کەس بالکی لە بالکا خوێندویانە و بوونەتە مەلا ١- مەلا سەعیدی برای ساڵح مەولوو کە لە مەسۆی لای کێلۆ مەلا بوو . ٢- مەلا سەعیدڕەهنمون کە مەلای ساوا بوو لە مەریوان . ٣- مەلا فایەق مەجیدی کوڕی میرزا سەعی مەجی بەگ مەلای مزگەوتی هەژارە بوو . ٤- مەلا مەحموود مەولودی کوڕی مەلا ئەحمەد وەسا مەولوو مەلایی ئەکرد ٥- مەلا عارف کوڕ مامۆسا مەلا باقر کە تەنیا ئەمیانە زیندووە .

## چوارەم جاری تازە کردنەوەی مزگەوتی بالک

کە لەو وەختا مەلاشێخ زاهیدی فاروقی بارام ئاوایی مەلای بالک بوو لە ساڵی ١٣٦٩ دا ئەم جارە مزگەوت بالک بە ئاسن درووس کرا خەرجی زۆر بوو کۆمەکیان لە دەرۆ بۆ ئەهات ، موهەندیس و ئازری ئەو مزگەوتە وەسا ساحێب چەشمییەری بوو بە پەیمانکار ، خۆی وەسای هەورامی بۆ ئەهانی وە درگاو پەنجە رەی ئاسنی بۆ ئەهانی ،خووا جەزای بە خێریان باتۆ ئامین . کە لە سەرۆ دوو حوجرەی هەیە بۆ فەقێ و مودەڕیس ، وە ژێر ئەو دوو حوجرە لەوەبەر هێزم دان بوو نیسە ئاشپەزخانەی فەقێیە ، وە جێی دەس نوێژ وا لە ژێر مزگەوتا وە دەس شۆری وا لە جێی خۆیا ، وەسائلی عیبادەتی ئامادەیە ، گلەیی لەو کەسە ئەکەم کە

بۆی کرێی و عیبادەتی تیا ناکا .له سەر درگای ئەم مزگـەوتـی بالکـا نوسـراوه :
مسجد مامۆستا مەلا باقر نوسازی ١٣٦٩ ش.
زوو موشکڵی خه ڵک زووتر خەله بوو که گرانی بووه وه هاڕینیشی زیاتر زەحمـە
ت بوو خەلەمان نەنارد بۆ ئاش دوای ٢٢ ڕۆژله ووشکێن هاڕیانوو هاتنۆ بۆ نەچن ،
ئیسه هەرزانی‌یه به ئاردی و به نانی یەته بەر دەسمان شوکری خـوا کـەیـن بـا
زیاتری کا . وه فەقیر زۆر به زەحمەت شوانی و ئاشەوانی و ڕەنجبـەریـان دەس
نەکەووت ساڵی وا بوو بۆ ئەم کارانه له دێیەکۆ ئەڕۆشتن بۆ دێیەکی تر، مەریواتی
زۆرتر ئەڕۆشتن بۆ عێراق و شارەزور بۆ کرێـکاری ، لـه ئـاخری کتـێبی فتـاوای
مامۆسا مەلا باقردا نوسراوه که له ساڵ ١٣٣٥ ق هۆردووی ڕوس خووا ڕیـسوای
کا هات بۆ ئێران شارو دێکانی وێران کرد کشت و کاڵی له بەیـن بـرد قـاتی دا
کەوت له ساڵی ١٣٣٦ قاتیەکی سەختی وا بوو باووک مناڵی خۆی سەرئـەبـڕی
گۆشتەکەی ئەخوارد . قیمەت خەله سەرکەوت لەوه بەر تەغاری گەنـم کـه سـی
مەنه ئەیان دا به دوو تمەن یا کەمتر لەوو گرانیا زۆر سەرکەوت مەنێ بوو به پێنج
تمەن پوڵ سپی قرانێ چاووڕەش تەغاری ئەدرا به ١٥٠ تمەن خـەڵـکی زۆر لـه
بەین چوو تا وای لێ هات له ڕۆژێکا له دێ چکۆلانەیەکـدا ده نـەفـەر یـا زیـاتر
ئەمردن له برسا به جۆری کەس توانا و دەسەڵاتی شاردنەوەو تەڵقینی مردووی
نەبوو بەڵکوو زۆرتر مردویان بۆ نەنه شارراوۆ له خاکا ئەمه هەمـو لـه گوناهبـاری
خەڵکەکەوه بوو خووا پەنامان با له قەهری ، جێگەیه هەیه لای جنـوبی باشـماخۆ
که پێی ئەووترێ چاڵه ڕووس شیوێکه ڕوسەکان ساڵی ١٣٣٥ کـه هـاتوون بـۆ
مەریوان لەویا خۆیان داوه له مەکۆ خۆیان شـاردووەتـۆ باشـماخی دێـیان چـۆڵ
کردووه لەوو هەردا چاویان تێوۆ بووه که سوارێ له چاڵه ڕووسۆ به پرتاوو چو بوو
بۆ باشماخ چووه حەوشی ماڵێ و ئه سپەکەی بستۆ تفەنگ و فیشەک لۆخەکـەی
دانا خۆی چووه ژورۆ پیاوێ ئاوسێی ئەو ماڵه چاوی تێیۆ ئەبێ فرسەت یەنێ و ئـه
سپەکه و تفەنگەکه ئەڕفێنێ ئەیباتۆ بۆ لای باشماخیەکان بۆ ئەو هەردە . که دونیا
ئارام ئەبێتۆ تەماشای ماڵەکه ئەکەن مناڵێ بەجـێ مـاوەو مـردووه . جـا بۆیـان

مەعلوم ئەبێ ئەو سوارە ژنێ بووە لە ڕوسەکان لەو ماڵا ئەو منالیە بووە بە جێی هێشتووەو مردووە . ئەم بەسەرهاتەم لە ژنێ باشماخیم بیست بە ناو حاجی ئامینەی قالە . سالی ١٣٥٨ ش ڕۆیم بۆ سەر گردی خاتو عاسیە لە بالک سەنگەرێ قەدیمی لەوێایە ئەگەڕام بە دەوریا دوو سکەی مسینم دۆزیوۆ نیشانی پیرەکانی بالکم دا ووتیان ئەو سەنگەرە لە سالی ڕوسەکەدا سەنگەری عوسمانی پێۆە بووە ئەو سکانە لەوان بە جێ ماوە .

من بیری سێ حکومەتی ئێرانیم دێ ١- ڕەزا شا کە پانزە سالّ شای ئێران بوو لە سالی ١٣٠٩ ش تا قەزای شەهریوەری ١٣٢٠ ٢- دوای باوکی موحەممەد ڕازا شای ئێران بوو لە ئاخری سالی ١٣٢٠ تا ٢٢ی بەهمەنی سالی١٣٥٧ ، حەمە ڕەزا شا ڕایی کرد لە ئێران بۆ ئەمریکا ٣- جومهوری ئیسلامی لە دوانزەی بەهمەنی سالی ١٣٥٧ ئیمام خومەینی بە پێشوازی باشۆ هاتۆ بۆ ئێران . ئیتر حاکمی ئێران بو بە جمهوری تا ئیستە کە ٨ / ٩ / ٨٩ یە کە سی و دوو سالە .

**یەکێ لەو ڕەسم و یاسا قەدیمانە کە لە مەریوانا بوو ( بووکە بارانێ) بوو**

لە قاتی بارانا منالّان بە دەسورو کۆمەک گەورەکانیان بووکە بارنەیان درووس ئەکرد بەم جۆرە دارێ سووکەی درێژی سێ متریان ئەهانی سی سانت لە خوار سەرە قەویەکەیۆ دارێ یەک متریان چەپ و ڕاس پێوە ئەبەست ، وەدەسێ جلی تازەی ژنانەیان ئەکردە بەری وەکوو موجەسسەمەی بووک ، کێش و هەوریان ئەبەست بە سەریۆ ، چارشێویان دا ئەدا ،کە وەکو بووکی لێ ئەهات یەکێ بە قووەتیان هەلی ئەگرت ، ئەیان گێڕا بە ناوودێ و دەورو بەریا ، جا منالّ ئەکەوتنە شوێنی لە حەوت سالە بەرەوژور تا بیس سالە وە ئەمیانە ئەووت : بووکە بارانێ خووا گیان بارانمان بۆ بارێنێ، حەوت جار ئەمیانە ئەووت . وە ئەمیشیانە ئەووت هەلاران و مەلاران یا خووا داکاتە باران بۆ فەقیر و هەژاران ، حەوتی جاریش ئەمەیان ئەووت ، جاری وا بوو ئەهات بە دەمیانۆ باران ئەباری ،من خۆم لە بیرمە لە سالی ١٣١٥ لە بالک بووکە بارانیان درووس ئەکرد لە دورۆ تماشام ئەکرد ،منالّ کچ و کوڕ ئەکەۆتنە شوێنی بە ناو دێیا تا کانی ژورۆ تا شێخ برایم لەوێۆ

ڕۆیین بۆ پیر موحەممەد تا شەخسەو دیونەکە ئیتر باران باری و بووکەکە تڕ بوو . یەکێ لە وانە کە لە خۆمانە ڕۆییوە بۆ سوئید ئەی ووت : ئەو ڕەسم بووکە بارانێ لە سوئید ئیسەش هەر هەیە لە گرە تەرک بووە وا دیارە ڕەسمی کۆنی عالەمی یە. بە شەرعی ئیسلام لە کاتی قاتی بارانا ئەبێ نوێژە بارانێ کەیین . ( ماموسا مەلا سەعیدی ڕەهنمونی بالکی ئەیفەرموو) : لە بالکا لە زەمان ماموسا مەلا مەحموود جوانڕودی یا ئەونە فەقێ بە حورمەتو ئازاد بوون لە ناوودێوۆ بەرەوژور ئەڕۆیین بۆ چەمەنەکە و تا ئەهاتینۆ بە چەپلە ڕێژان و گۆرانی ووتن بە ناودێدا . فەقێ دوانزە ئەفەر ئەبوین ئەهلی ئاوایی بەگزادە تابێعیان بیست ئەفەرێ ئەبون کەس زاتی ئەبوو بلێ فەقێ بۆ چی وا ئەکەن . دەورەی سەو پەنجا ساڵە بە بێ بەین هەروا بالکی وان لە خزمەت مەلا و فەقێ و مزگەووتا ئیسەش هەر وەکو ئەووەڵ جار گەرم و گوڕن ، فەقێ لە چەمەنەکە هەڵ ئەپەڕین ، سێ بازیان ئەکرد ، جەغزێنیان ئەکرد ، حەووت هەنگاوو حەووت بردیان ئەکرد ، کۆکۆنێیان ئەکرد . ئەمانە گەمەوو گاڵتەی ئەو ڕۆژە بوون ، وە فەقێ لە ڕۆژی تەعتیلییا ئەم گەمانەیان ئەکرد لە ڕۆژانی ترا هەر خەریک خوێندن بون .

(ڕاتبەی فەقێ ) ڕاتبە بە عەرەبی یانێ جیرە

فەقێ چۆن بەڕێ ئەچوون : بۆ نان هەموو ڕۆژێ سوختە یانێ فەقێ کەم خوێنەکان ئێوارانە بە ناو دێیا ئەگەڕان بۆ نان بۆ نان هەر ماڵێ نانێ ، وە بۆ پێخۆر ئەگەران هەر ماڵێ کاسەیە ، بە ئەندازەی پێویستی خۆیان نان و پێخۆریان ئەهانی بۆ حوجرە . بازێ ماڵ وەک بەگزادە کە دەوڵەمەن و دەس بڵاوو بون نیوەڕۆ جیرەی چێشت و نانیان ئەدا بە فەقێ . جا فەقێ کە ئەڕۆیین بۆ جیرەو نان ئەیان ووت : ڕاتبەی فەقێ ڕەحمەتی خواتان لێ بێ ، ئەواتیش زۆر بە ڕوو خۆشیوۆ ئەهاتن بە دەمیانۆ .

## ڕاتبەی فەقێ لە پاییزا لە ناو دێدا

فەقێی حوجرە لە گەڵ دەسەیە بەگزادە و لە خۆش تەبیعەتی ئاواییا ئەگەڕان بۆ چێشتە کوڵێن ، لەوە کە خۆراکی خۆیان بوو هەر یەکێ شتێکی هەڵئەگرت لە

ڕۆن و دۆینەوو شەلەم و برنج و قەن و چایی و پارەو پیازو هێلکەو بڕیتش جا خۆیان بۆ خۆیان لەمانە چێشتیان درووس ئەکرد تا تەواوو ئەبو . (ڕاتبەی فەقێ لە بەهارا) لە گەرمەی مەشکەی بەهارا لە ناوایبا فەقێ خۆیی ڕاتبەی کەرەیان ئەکرد بۆ خەرجی حوجرە بۆ قەن و چایی ، ئەم ڕاتبانە وەسیلەی ژیانی فەقێ یی بوون ، (ڕای وابوو ڕاتبەی دێهاتی تریشیان ئەکرد ) فەقێکان بالک لە دەوری سالی ١٣٤٤ ش ڕۆیین بۆ ڕاتبەی کەرە لە خێرابات ، مەلا سەی مەسعوود ئەمتەمی هاشمی لە بەر درگای مالێکا لە سەر (دۆلی دنگێکا ) دانەنیشی وە ئەلێ بە ژن ساحێۆ مالەکە :بڕۆ هەر چێ کەرەی ئیمڕۆتانە بیهێنە بۆ ئێمە جا بەزمێ گۆرانیت بۆ ئەلێم ژنەکە ئەڕوا کەرەکەیان بۆ ئەنێ ، ئەویش گۆرانیەکەی بە چەپلەوۆ بۆ ئە لێ ژنەکە دەس ئەکاتە گریان وە قۆلی ماچ ئەکاو ئەلێ: بە قوربان بەرەکەت عیلم بم جا خۆ تەواو سەروەت ئێمە قیمەت ئەو لیباسان تۆ نابێ ، ئەمە بەرە کەتی عیلمە کە تۆ هاتووی بۆ بەر درگای چلکنی وەک من ، شانی ماچ ئەکات و خواحافیزی لێ ئەکات ئەڕوات ، مەلا سەی مەسعوود زۆر جووان چاک بوو زۆر دەنگی خۆش و خەتی خۆش بوو وە زۆر عالمێکی چاک بوو .

## لە زسانا فەقێ پاشاییان ئەکرد

بە چیرۆکی تەشکیلاتی حکومەتی یەکێکیان ئەکرد بە شا لە کاغەز تاجی شاییان بۆ دروس ئەکرد لیباسی شایانەیان ئەکردە بەری ، یەکێکیان ئەکرد بە شیخ الاسلام بە لیباس و مێزەرۆ ئەبوا زۆر زیرو قسەخۆش و مەزاحی بوایە ، یەکێکیان ئەکرد بە میر غە زەب ئە بوا زۆر زیر و زلەو بە قووەت بووایە، گورزێکی بە دەسۆ بوو پەسا پەسا لە بەر دەم شادا ئەیدا بەعەرزا وە ئەیووت : (غرە مشو دنیا فانیست ) فەقێکان وکوڕە چاک و چالاکەکانی ئاوایی ئەبوون بە ئەندامی حوکومەت ، کلاوو کاغەزیان ئەنا بە سەرۆ سەربازەکان هەر یەکێ دەسمالێ سوریان ئەبەستە قۆلی ڕاسیان بۆ جیاوازی . یەکە یەکە پیاوی هەموو مالێکیان ئەهانی بۆ مزگەووت بۆ خزمەت شا و قازی . هەر یەکێ بە گوێرەی حالی خۆی

جەریمەیان ئەکرد پولێکیان لێ ئەسەند بۆ فەقێکان بە پرس و ڕای هەموویان، کەسێ لار جولایەتۆ ئەیان برد بۆ لای شیخ الاسلام ئەویش یا عەفوی ئەکرد یا ئەیدا بە دەس میر غەزەبۆ تەمێی ئەکرد. ئەم هەموو تە شکیلاتە بە یارمەتی و دەسور بەگزادە بوو. بەگزادەکان بالک خوا جەزایان بداتۆ بە خێر. وەختێ لە مەریوانا باخ کەم بوو ئەمان هەر باخیان بوو چەمەنەکەو هەسەن بەتاقۆ باخەکانی دەورو بەری کانی و حەزەکە سەمەریان زۆر بوو بەش خەڵکیان زۆر لێ ئەدا باخەوانیان بو بە نیوەکاری سێ مۆریان بوو لێی نوسرا بوو نیو مەن بدە، یەک مەن بدە، دوو مەن بدە ئەوو مۆرتە ئەبرد بۆ باخەوانەکە، هەنگوری پێ ئەدای مۆرەکانی هەڵئەگرت بۆ دوایی لە سەر ئاغا حەساوی ئەکرد، من خۆم لە بیرمە ساڵی ١٣١٢ش چل دانە مۆریان دا بوو بە ماڵ مامۆسا و چل دانە مۆر بە فەقێکان، زۆر لەززەتی بوو، مامۆسا مەلا باقر بالک ئەیفەرموو لە گە ڵ حاجی حەبیبەالله بەگ و حاجی حەمەو بەگ ئەحمەدی بەگی بالکا ڕێمان کەوتە ماڵ حاجی مشیر دیوان ئەونە ئەدەبیان ئەکرد لە من و ە حورمەتیان ئەگرتم حاجی موشیر ووتی مامۆسا ئەم پیاواتە زۆر فەهمیدەن ووتم ئەمانە ئاغەی منن ووتیان ئەم جارە ئەبێ زۆرتر مەمنونیان بی، دۆعای بە خێریان بۆ بکەین. باقی میللەتی مەریوان بە خاس و خراوۆ ماقوڵ و ناماقوڵ و بۆ مامۆسا هەروا بوون هەر واتە خووا جەزایان باتۆ هەمویان، ڕاسە کەن ئەڵێن: قەدر و قیمەتی زەڕ تاقی ئەکەیتۆ بی بەلای زەڕنگەر،
مامۆسایش زۆر قەدر شناس بوو لە نۆبەی خۆیا جەزای ئەدانۆ وە هەمیشە ناوی بە چاک ئەبردن و دۆعای خێری بۆ ئەکردن.

## ئەو شەش ڕووداوانە کە لە زەمان ڕەزا شادا ڕوی داوە

١- چەتە بوو، چەتەی سەی عەتای باینچۆیی، چەتەی حەمە تاڵی بانەیی، حەمە تاڵ و چەتەکانی لە دەوری ساڵی ١٣١٦ ش ڕانەکەی هەنجیرانیان بردبوو بۆ دەور بالکیەدەری عێراق سەی عەتا و چەتەکانی ڕێیان پێ گرتبون و ڕانەکەیان لێ سەندبونۆ حەمە تاڵیان کوشت کە ڕیشێ درێژی بوو دوای دوو

ساڵ سەی عەتا لە کێوی ڕوشی لای لەنگە دێ پۆلیسی عێراق کوشتیان قەبــری وا لە لەنگەدێی شلێر .
٢-ئەوو چەتانە ئە بوا بژێویان بە سەر میللەتۆ بوایە ، بۆ نمونــە دوو دەوڵــەمــەن بالکییان گرت ١- خالۆ فەیزەی حەمەمین ٢- حەمە عەتتار کە دووکاندار بوو لــە مە ریوان لە ساڵی ١٣١٦ ش دووای دوو مانگ هەرداو هەرد هەر یــەکــێ بــە ٥٠ تمەن بەریان دان . لە بەر ئەو چەتانە دەوڵەت هەردێیە سێ تفەنگی پــێ ئــەدان بۆ پاسی خۆیان بە زەمالەت قەیخوا و ڕیش سپی ئاوایی بالک سێ تفەنگیان پێ دابوون .
٣-لەوڕوداوانە سەربازی بوو . ئەووە ڵ دەوری سەربازی لە بالکا چوار ئەفەر بوون بە سەرباز لە ساڵی ١٣١٨ ش ١- حەبیبەالله بەگ حەیدەری ٢- حــەمــە ڕەحــیم حاجی قادر ٣ – حەمە کەریم نادری ٤ – حەمە کەریم عــەزیــزی ، لــە دووای ١٨ مانگ سەربازی ئەمانە لە قەزای شەهریوەری ١٣٢٠ ش کــە دەوڵــەت ڕەزا شــا تەواو بوو ئەمانو سەرباز هەمویان ئەجاتیان بوو ، لەو دەورەی سەربازیا ئــەفــەرێ ئەولواحد ناو ئشکاشی ئەکەن بە سەرباز ئەونە پای زل ئــەبــێ دەوڵــەت ئــێران کەوشێکی نابێ لە پێی کا لە بەر ئەوە مەعافی ئەکەن لە ســەربــازی ، ئــەبــوا بــە تایبەتی کەوشی درووس کردایە من دیومە .
٤-لەوو ڕوداوانە سوون بوو کە باڵداری چکۆلەس بۆگەنە لە ڕەنگ و لە وێسانا لە کیسەڵ ئەچێ ، سوون شیرەی گەنم ئەمژێ لە بیس ڕۆژا ، دە ڕۆژی ئاخری بەهار و تا دە ڕۆژ ئەووە ڵی هاوین ئیتر گەنم دانی ئەئەما گرانی دائەکەووت ، ئەو سوونە لە دەور دەریای مەدیترانەدا پەیدا ئەبێ ئیسە لە بەهارا کە تازە زینو ئەبێتۆ ســەم پاشی ئەکەن بە تەیارە ئەیکوژن نایەڵێ بڵاوو بێتەوە بە ووڵاتا دەسیان خۆش بێ ، دوای گرانی و سوون خواردن مە ریوانی گەنمە شامی و زەررات و دەیمیلەو جــۆ بوو ، جۆ زوو ئەگەیی سوون فریای ئەئەکەوت . ئەوانی تر دێــر ئــەکــەوتنــە خــۆ سوون تەواوو ئەبو . جا ئەمانە خوگە پاسیان گەرەک بو ، جوتیاری فەقیر بــە ڕۆژا کاریگەر بوون بە شەوا پاسەوان ، بە سەگ و ساچمەزەن ئەڕۆیین بۆ خوگە پــاس

هەر کامیان دەسی بڕوایە لە ناو زەرعاتەکەیا هەرزاڵێ بەرزی ئەبەست کە خوگ لێی نەدا . خوگ بە سێ جۆر زەربەت ئەدا لە بەشەر ، یا بە پێ ئەیساویتۆ ، مێچکە بێ گازی لێ ئەگرێ نێرە بێ شفرەی لێ ئەدا ، شفرە وا لە بەیین دەدان خوگا وەکو چەقۆ تیژە بیدا لە هەر کەس باش زەخماری ئەکا ، شفرەی دا لە پیاوێ لە بالک بە ناو فەرە ج ڕۆسەم بەگ دوو مانگ لە جێدا بوو . بە دوکتۆری و دەوای ژنێ سەرکەلی قەیخوا ژنە لەیلێ جا خۆشێ بو . خوگ تەنیا بەچکەیەکی لە سکا بێ نێرە ، پێی ئەڵێن یە کانە ،ئەگەر بە سکێ چەن دانەی بوو هەمو مێچکەن پێیان ئە لێن مالۆس . خوگ بە دوو جۆر زەرەر ئەدا لە زەرعات فەلا ١- بە سەوزی بە سم هەڵیەگێرێتۆ بۆ مشک و ە بۆ سەلکە گیایە ئەگەڕێ بە ناو پیازە خوگانە کە بیان خوا ٢- کە زەرعاتەکە گەیی ئەیخوا . لە زسان کە دێهاتی بە تاڵ ئەبون خوگە ڕاویان ئەکرد ، سەگیان تێ ئەکرد تفەنگیان پێوە ئەنا ، سەیری خۆش بوو ساڵێ لە زەمان ڕەزا شاداخوگێکیان لای ئاوایی بالکا کوشت کە کەووت بە عەرزا بێ ڕەحمانە تێی بەربون هەرچێ زیڕانی بە تەور لەت و پەتیان کرد بۆ سەگەل ئەیان ووت با چەشت بێ با فێر بێ بۆ خوگێتر . نیسە شکار بانی بووە بە باوانی ئەوو دوڕوندە هەردیانە ، خوێنیان ئە سێنن لە کەسێ بیان کوژێ .

٥-لەو ڕوداوانە سجیل بوو کە بە عەرەبی یانێ نوسراوە بە فارسی پێی ئەڵێن شناسنامە ، زۆر ناوێ جوانە ، یانێ بەم سجیلە ئەو نەفەرە ئەناسرێتۆ. ساڵی ١٣١٤ هات بۆ مەریوان . مەئمور بە دێکانا ئەگەڕان بۆ سجیل دان بە خەڵک . هاتنە بالک سەعی بەگ ڕۆسەم بەگ قەیخوا بوو ئەو ئەووەڵ ئە فەر بوو لە سجیل وەرگرتنا ، باوکم دوهەم بوو من پێنجە بوم ، تەئریخی لە دایک بوونم ١٣٠٥ ش ، ئەم سجیلە فائیدەی زۆرە ١- کەسێ لە غەریبیا بمرێ بەو شناسنامە ئەزانن کێ یە هەواڵ ئەبەنۆ بۆ جێگەی خۆی میراتی ئەبەنۆ بۆ قەوم وکەسی خۆی ، حاجی یە دە رەناخێی مەریوانی لە مەککەماشین لێی دابوو مرد بوو میرات و خوێنەکەیان هانیێ بۆ کەسەکانی بۆ دەرەناخێ٢- ژنێ گەرەکی بێ شوو کات بەو شناسنامە کەس وکاری ئە دۆزرێتۆ .٣- ئەبێ هەموو کەس خۆی بناسێ قەوم و

کەس و فامیلی خۆی بناسێ ٤ – کەسێ بڵێ من لە فلآن تایفـەم بـەو شناسـناما نەزانێ ڕاس نەکا یا درۆ ٥- هەر کە سێ لە تایفەیە نەبێ خۆی لـەوان حـەساو نەکا وەکو سەیید ، جەریمەو زیانی زۆرە ، سجیل نالەمانە بەرگری نەکا .
٦-لەوو ڕوداوانە گرتن بەگزادە بوو لە ساڵی ١٣١١ ش نۆ ساڵ لە زینـدانا بـوون تا قەزای شەهریوەری ساڵی ١٣٢٠ ، لە زیندان ئەوانەیان کە مابوون نەجاتیـان بوو ، زۆریان بە غەریبی و بە شەهیدی لە زیندانا مردن دەرەجاتیـان عـالی بـێ ، بەگزادەکان بالک شەشیان لە زیندانا مردن سـێیان هـاتنۆ ،( لـە ساڵـی ١٣٢٥ بەگزادەی مەریوان بە ڕیاست مەحمود خان کانی سانان چون بە گـژ دەوڵـەتـا ، شەوێ دایان بە سەر پادگان مەریواناو شکان ، فەرمان‌بە دەس مـەریـوان لـەوو وەختا ئەفسەرێ سنەیی بوو بە ناو خاکسار ، ئیتر بەگزادەکان ڕایان کرد بۆ ئێراق ، نەیانە هێشت خەڵک ناودێکان بێنۆ بۆ ناو دێکان خۆیـان ، بـەشـکوو دەوڵـەت ئێران لێیان ببورێ وە قەبوڵیان کا بێنۆ بۆ ماڵەکان خۆیان ، ماڵ باوکم مـانگێ بـە ناوارەیی لە ماڵ مامۆسا شێخ کەریم ئەسکۆڵا بوو . هاتینۆ بۆ توتونـدەر بـو مـاڵ قازی کە بێینۆ بۆ بالک باوکم بیستبووی کە بەگزادەکان ووتویانە مەلا باقر بـرواتۆ بۆ بالک ئەیکوژین ، ناچار ڕوبە ئێراق ڕۆیین سێ شەو لـە هـەردی کـانی بـاین بوین لای گۆمەتاشڵی بەرانبەر کانی‌کەوەو پیران بە ماڵۆ لە گەڵ چـەن ماڵـێکا ، ڕۆژێ ووتیان بە باوکم مەئموری دەوڵەت یەت ئەهلی ئەم هەوارە بە زۆر ئەباتۆ بۆ مەریوان باوکم خەمی کتێبەکانی لێ هات کە ناحاڵییە بیان بات مـن مـەوجـێکم وەکو هۆڕ لێ کرد و کتێبەکانم تێ خست و خستمە سەر پشتێ ماینـەکـەمـان وە بردم بۆ ماڵ مەلا مەحمود سیاناو کە مەلای کانی سێف بوو کە هاتۆ لـە مـازوو زۆر بە لامۆ عەجایەب بوو، کەتێبەکانم دایە دەسی و هاتمۆ بۆ کانی باین . باوکم زۆری پێخۆش بوو کەچی مەئموریش نەهاتن . باوکم لە نزارەو خونیانە و پێنجوێن تـێ کەوتبوو کەس جێی نەکرد بوۆ . لە ناچارییا بە ماڵۆ ڕۆیین بۆ جۆمەرەسی بـۆ لای شێخ حامید ، ماڵە چۆڵێ بو چوینە ناوی بە ئەمانەت ، دووبارە باوکم ڕو بە بیـارەو گوڵـپ ڕۆیی هەر جێی بۆ پیا نەبوو . شێخ موحەممـەد کـوڕ شـێخ حیـسامالـدین

قەولی پێ دابوو کە بیکا بە مودەڕریس گوڵپ ، لەویا مەدرەسەیە بێ وەکوو بیارە باوکم زۆر پێی خۆش بوو ، دەورەی دوو مانگ لە گوڵپا بووین باوکم پێنج نەفەر فەقێی بوو کە یەکێکیان مەلا موسەففای زەڵمی بوو تەشریحی ئەخوێند لە ماڵێ زۆر خراوا بوین بە ناو ماڵ حەمە حسەین ، شێخ موحەممەد هیچ کارێکی نەکرد . ڕۆژێ پیاوێ ووتی بە من : من پیاوی شێخ موحەممەدم ئەوە پاییزە سارد ئەکا باوکت دەس خڕەی قسەی شێخ موحەممەد نەبێ جێیە بۆ خۆی پیا کا شێخ موحەممەد سێ ژنی هەیە خەم ئەوان ئەبێ خەمتری نییە ، باوکم قسەی ئەوو پیاوەی بە قسەی شێخ موحەممەد ئەزانی زۆر ناڕەحەت بوو تا خوا فەرێعی کردۆ وە حاجی ئەمیری ئەردەڵانی قەووم باوکم لە سنەوۆ لە تە ڕەف دەوڵەتۆ دەعوەت نامەی نووسی بوو بۆ باوکم کە بێتۆ بۆ ئێران زیاتر لە جاران حورمەتی ئەگرین باوکم هاتۆ بۆ بالک بالکی هاتن بۆ گوڵپ بە شوێن ماڵەکەی باوکما جا هاتینۆ بۆ بالک . تۆ بەخێر من بە سلامەت .

| | |
|---|---|
| زەلیلی باوکم لە دڵ دەر ناچێ | هەر تا ئەو وەختە گیانم دەر ئەچێ |
| لە گوڵپا کەسێ لێی نەئەپرسین | کە ئایا تێرن یا ئێوە برسین |

لە ئابانی ساڵی ١٣٢٥ هاتینۆ بۆ بالک هیچ بە دەر نەمابوو ووتیان مەلا فایەق مەجیدی بالکی نیوەی سەرفیترەکەی بردووە بۆ خۆی کە جەژنی ڕەمەزانی بۆ کردوون ، هەر چێ مەلا مەحمود مەولودی بالکی هەوڵی دابوو هەڵیگرن بۆ ماموٚسا مەلا باقر بە گوێی نەکرد بوو . وە سەعیدی حەمە عەلی نیوەکار باوکم بوو لە مەڵا قوتبی دێتمیلەی کرد بوو بەشەکەی خۆماتی پێ داینۆ ئەو پاییز و زسانە ئەوە خواردنمان بوو .

## ( بالکی بە چی بەڕێ ئەچوون )

زور بە جووت و گا و حەیوانداری کە حەوانیان بە پلو پوش و گیا و گەڵای دارسانەکەیان بە خێو ئەکرد لە بەهارا تا پاییز شوانیان ئەگرت بۆ ڕان و بەرغەل و گاگەل ، بە دەم خۆیان لەوو دەشت و دارسان بالکا ئەلەوەڕان تا زسان بە کا و گیاو گەڵا بەخێویان ئەکردن . گەڵایان بە کۆڵ و بە بار بۆ ئەهاتینۆ ، لە بیرمە

پیاوێ بالکی به ناو سالح سۆفی ئەحمەد له دەورەی سالی ١٣١٥ له ژێر کۆلـه گه لادا مرد . چیلکەی گەلا کۆمەکێ زۆر باش بوو بۆ سوختی زسان کـه لـه داری ئەو دارسانه ئەیانهانی . من له بیرمه له ئەووەل زەمان ڕەزاشادا بالک هەشتا مـال بوو چل جووتی تیا بوو ، جا جووت کردن چەنێ زەحمەت بوو . پێغەمبەری ئیسلام علیه السلام زۆر حال زانی خەلک بووه له هەر مالێکا ئێرەق و ئیری چـاوو پـێ کەوتایه ئەیفەرموو ئەمه ئەسبابی زەحمەته . له عان جووتـا لـه بـەهاربیـانی زوو کوڕی منالی نابالقیان هەلئەسان له خەوو گا بلەوەڕێنێ لەوو دەشـتا تـا بـاوکی ئەچێ بۆ جووت . ئێواره که گاکانیان بەرئەدا گایی ئەلەوەڕان تا تاریکی ئـەکـرد . باوکه که جوتیار بوو دایکەکه و باقی منالەکان ئەبوا هەمیشه خەریکی کاری ناوو مال و دەرو دەشت بووایەن ، کاریان فەوتی بوو . بێجگه لەمانـه کـوڕانی نابالـق لەتەی ڕان و گاگلیان ئەبرد بۆ لەوەڕ له بەهارا تا شووان عوموميـان ئـەگـرت بـۆ تەواو ئاوایی ، له سالی ١٣٣٣ ش دا من مەلای بـەرقـەلـا بـووم کـوڕێ مالـێ ووڵاخەکان ئێمەیشی ئەبرد بۆ لەوەڕ ڕۆژێ گورگێ ێێ بۆیان مانگایێ بـه ملمـان بوو به حۆچۆ ئەڕوا بۆ گورگەکه که تاوی ئەنێ له خۆشییا کوڕی ئەو ماله ئەهات و ئەیووت : مانگاکه دەرکەن بابیبەم بۆ ئەو هەرده گورگم بۆ تاو ئەنێ . لـەوه پـێش جوتو گاعومدەی وەسیلەی ژیان خەلک بوو له هەموو کارێ زەحمەتـتـر بـوو لـه مەریوانا به گا وه کەمتر به کەر جووتیان ئەکـرد . لـه گرمیانـا دیومـه بـه هێـسر جووتیان ئەکرد وه له موکریان و مەهابادا بـه کـەل گامێش جووتيـان ئـەکـرد . ئەسبابی جووت و گا وەسای خاس و به سـەلیقـه ڕێـکی ئـەخـست وه پوولـی ئەئەسەند ، به کۆمەک و ئێحسان ئه یکرد . زەوییەک که ئەیان کرد بـه خـەلـه ئەبوا له پێشا هێل هێل کرایه به هەر بەینێکیان ئـەووت بانـەیـێ . هـەمـو ڕۆژێ جووتیارەکه بەش ئەوو ڕۆژه له مالێ تووی ئەهانی ئەیوەشان به بانەکانا تا تووەکه تەواو ئەبوو جا دەسیه کرد به جووت . ڕایه گاکان بترازایه به گاکانی ئەووت هۆرته یانێ هێلت بڕی ، وا فێریان کردبوو ئەهاتنۆ سەر هێلەکه . تا ئێواره ئەوو جوتیاره هۆ هۆو بەر بەری بوو به شوێن ئەوو دوو گاوۆ ، وه لێ نیـوەڕۆ ووچـانی ئـەدا بـه

گاکان نیرەکەی لانە برد لە ملیان ناڵف و ناوی پێ نەدان خوێشی نوێژی نیوە ڕۆی نەکردو ئیسراحەتی نەکرد نانی نەخوارد گاکانی ئەبەستۆ لە بەینی بەیانی و نیوەڕۆدا کەمێ ووچانی ئەدا بە خۆی و بە گاکان، پێیان ئەووت گاووچان وە لێ ئەینەکردۆ لە نیرەکەیان وە ئەیانووت : گایی جووت و جوتیارزادە خزمەتیان ئەوێ ئەرکیان قورسە . جوتیارەکە هەر ڕۆژێ دە ورەی شانزە کیلۆ تووی ئەبرد ئەیوەشان تا جووت تەواو ئەئەبوو ئەوە کاری بوو . با بزانین گەنم دوو نەوعە لە هەمویان باشتر بەهارەیە کە بەهاریش بیوەشێنی زۆر باش ئەبێ ، نەوعێکیان گەنمە پاییزەیە لە نیوەی هاوین بەو لاوۆ زەوی بۆ ئەیەرن ئەیکەن بە کۆڵەبەس زۆر بە بڕشتە دوای ئەویشە تا زسان تەواو ئەبێ وەختی وە شانن . ئەو گەنمەسە جۆ لە بەهارا وە شانویانە زۆر بێ‌دەغیلە و جوان بوو ، لە گرانییا چوار نەوع خلەیان ئەوەشان لە مە ریوانا دووان دێمی ، زەڕڕات و دێمیلە، دووان ئاوییە ، کاڵۆ و گەنمە شامی ئەم دووانە لە نیوەی بەهار بەو لاوۆ بیان وەشانایە باران لێی ئەدایە باشتر و بە بڕشتر ئەبوو ، ئەم چوار نەوعە خەلە خوگ زۆر حەزی لێ ئەکا خوگە پاسی گەرەک بوو ، (نەوعێتر لە بەرهەمی کەشاوەرزی بێسان بوو ) ترۆزی و خەیار و شوتی و کاڵەک و کولەکەو بامیەو باینجان و شەمامەو لیمۆ کە لە دێم و بەراوا ئەبن ، دەیمیەکەی خۆش و بە مە ززەترە بە تایبەت لە دەوری زرێبارا ، وە لەناو ئەو بێسانا پێشەی سەر کەرێکیان ئەکرد بە دارێ بەرزۆ لە ناوو ڕاس بێساتەکەدا دایان ئەچەقان ئەیان ووت بۆ چاوو چڵە باشە کە ووتویانە بێسان بێ سەرەخەر (زووتر لە ووڵاتی کوردەواری یا تەماکۆ و مەرەزەیان ئەکرد ) کە کارێ زۆر سەخت بوو . برنجی مەریوان لە هەمو برنجێ خۆشتر و بە مەزەتر بوو وە ئەم دووانە نیوە کاری بوون نیوەی خەرمانەکە ڕەعیەت ئەیبرد و نیوەی مالیک کە ناوەکەی تەرخان ئەکرد بۆ ئەو مەرەزە تا پاییز. ئیستە ئەو دوو کارە نەماوە کە ئێختیاری ئاوو زەوی لە دەس مالیکا نەماوە کە بیکا بە تەماکۆو مەرەزە چەڵتوک کە ئەیان وەشان تا پاییز ئەبوا ئاوی پێوە بێ . وایان ووتووە چەڵتوک حەز ئەکا بنەکەی لە ئاوا بێ و سەر لولەکەی لە ئاوورا بێ ، وە لە گرمیانا لەبەر ئەوە بڕشتی

زۆرترە بەگزادە زەحمەتی زۆریان ئەکێشا لە گەڵ مەرەزەدا چاوەریـان ئـەکـرد ئاوەریان بۆ ئەگرت بە ناو گۆخڵ تا وەخت خەرمان بە لایۆ بێ بـەهـار بـە قـەی توەکەی گەنمی پێ ئەدا و وە لە سەر خەرمانان بە قەی تووەکەی چەڵتوکیان پێ ئەدا لە خەرمانەکە ، ئەبوا تا ئاخر خەرمان بە شەوو بەڕۆژ قەتیز بوایە بە لای ئـەو قاڵبە مە رەزەوە پاس و ئاوەری کردایە زەحمەتی تەماکۆ کاری لە مـەریوانـا زۆر بوو شوکر باوی نەماوە خۆزگا ئاویشی نەئەما .
بۆ دەفعی بەڵای تەماکۆ ئەم حەووت شێعرە م نووسی .

| | |
|---|---|
| شوکر زەحمەتی تـەماکۆ نەما | خۆزگا تریاکیش ناوی نەئەما |
| لایبە تـەماکۆ تـەماکۆ تاڵـە | هەڵمژین دووکەڵ کاری بەتاڵە |
| دووکـەڵ قرخن وقـیزەونتە کا | عاقڵ چۆن کاری بەو جۆرە ئەکا |
| چل ساڵ زیاتر تـەرکم کردووە | خۆشحاڵم کارێ چاکم کردووە |
| تۆش ئەگەر عادیت ئابەم بەڵاوۆ | تـوڕی دەلایبە بینێ بـەو لاوۆ |
| با بە سالمی و بە بێ نـەخۆشی | بژی تا ماوی بە شادی و خۆشی |
| تەرکی کە ئیتر خـۆت ئەسێنیتۆ | خۆت لـە مانـویی ئەحەسێنیتۆ |

## تەریقەی قادری و ئەقشبەندی

هەر دوو کیان لە بنەڕەتا حەقن وە لە سەر ئەساسی شەریعەت دانراوون کەسـێ کە دیپلۆمی شەریعەتی ئەبێ لە دانشگای تەریقەتا ڕێی ناکەنۆ ، پێغەمبەر خۆمان حەزرەتی موحەممەد درود و سەلامی خوای لەسەر دەرسـی تـە ریقـەی قـادری ووتوە بە حەزرەت عەلی ئەویش دەرسی بە مریدە تایبەتیەکانی خۆی ووتـوە تـا دەس بە دەس گەیوەتە دەس عەبدوالقادر گەیلانی سەلامیان لە سەر وە لە وێدا بە ناو ئەوۆ مەشهورە بە تەرێقەی قـادری. پـەیـڕەوەکـانی زۆر گـردن کـەچـی شەریعەت بوون . بە موو لە شەریعەت لایان ئەدلوە وە بە دەسور شەرع سەیـر و سلوکیان کردووە .
وە پێغەمبەر علیەالسلام دەرسی تەرێقەی ئەقـشبەنـدی ووتـوە بـە حـەزرەتـی ئەبوبەکری سدیق ئەویش بە تایبەتی دەرسی بە موریدی هـەڵبژێـرراوی خـۆی

ووتوه تا گەییوه به دەس شاهی نەقشبەند شێخ موحەممەد بوخارایی لەو یا مە شهوره به تەریقەی نەقشبەندی ، ئەمیش تا پێگەییوه له تەریقەتا سێ مورشیدی گەورەی وەفاتیان کردووه . که یه کێکیان ئەمیر کەلال بووه دوای فەوتی ئەوان لە دەرسی تەریقەتا لێی ئەشێوێ نیشکاڵێکێ بۆ پەیا ئەبێ به ئەولیای زینو بۆی حەل نابێ . ناچار پەنا ئەبا به مەرقەدی حەزرەتی عەبدوالقادر گەیلانی دوای دوسەد ساڵ فەوتی ڕوو ئەکاته مەرقەدی و ئەڵێ :

ای پیر دست گیر دست مرا بگی     دست مرا چنان بگیر که تو گویند دست گیر

ئەویش له مەرقەدەکەیا جووابی ئەداتۆ و ئەڵێ :

ای شاه نقشبند نقش مرا ببند     نقش مرا چنان ببند که تو گویند نقشبند

فەورەن نه قشێ له دڵیا پەیا ئه بێ و نیشکاڵەی بۆ دەفع ئەبێ شێخ موحەممەد بوخارایی شێخ عەبدوالقادر گەیلانی ناوی ناوه شاهی نەقشبەند . ئیسەیش بۆ که سێ به ڕاسی موریدی نەقشبەندی بێ ئەو نەقشه هەر هەیه ، عەبدوالقادر گەیلانی کوڕی شێخ ساڵحی جەنگی دوزه خەڵکی ڕەشت و گیلانه له ئێران . بۆ تەئریخی لەدایک بون و فەوتی ئەم شێعره ووتراوه :

انّ بازالله سلطانُ الرجال     جاء فی العشقِ تَوفّی فی الکمال

واته گەورەی پیاوەکانی خووا که عەبدوالقادری گەیلانی یه له ساڵی ٤٧٠ ق لە دایک بووه دوای ٩١ ساڵ عومر له ساڵ ٥٦١ فەوتی کردووه مەرقەدی وا لە بەغداد .

به سەر ئەک به پێ چۆ بۆ زیارەتی     بەشکو کەویته بەر شەفاعەتی

دوسەد ساڵ دوای فەوتی عەبدوالقادر گەیلانی شاهی نەقشبەند هاتوەته دونیاوۆ .

عەبدوالقادر و شاهی نەقشبەند     پیر و موریدن زوانت بکه بەند

فیتنەیی نەکەی له بەین ئەوانا     با ڕیسوا نەبی له لای ئەوانا

له زەمان زووا لەم کوردوستانا هەر تەریقەی قادری بووه تا مەولانا خالید ڕەحمەتی ڕۆییوه بۆ دیهلی وبۆ خزمەت شێخ عەبدواللەی دیهلەوی ، دوای سەیر و سلوک له لای ئەو ئەبێ به خەلیفه ئەم تەریقەی نەقشبەندیه به دیاری هانی بۆ

ئەم کوردوستانە وە بۆ شام لە ساڵی ١٢٣٤ ق ، وە عولـەمـای ئـەم ووڵـاتە بـە عیشق و ئامادەگی زۆرۆ لێیان وەرگرت وە فێری بوون وچەن خەلیفـەی لـێهاتوی وەک شێخی سراج‌الدین تەوێڵە یی تێگەیاتووە و پێگەیاندووە زۆر زوو تەرێقەی مەولانا خالید نەقشبەندی نەشنونمای کرد . زۆری پێ نەچوو زۆرتر خەڵکی ئـەم ووڵاتە بە دڵگەرمی زۆرۆ پەیرەوی بوون و کەوتنە شوێنی . ناشکوری نەبێ لـەم زەمانا شێخی حەقیقی یا نەماوە یا ئێمە نایناسین . ئەهلی تەریقەت نەبێ بە مـوو لە شەریعەت لانەدا .

ماموسا مەلا کەریم بە توندی فەرمویەتی :

خیلافی شەرعت دی لە ئەهلی حاڵ تێی هەڵدە ئەگەر بیشفڕێ بە باڵ

منیش بە نەرمی ئە ڵێم :

شێخی حەقیقی نــەماوە ئـەمڕۆ بە غەڵەت بۆلای هیچ کەسێ مەڕۆ
کەسێ ئەخۆش بێ دەوای تۆ ناکا فریای خۆی کەوێ دوکتۆر پــەیاکا

لە دێی بالکی ئێمەدا دەروێش و سۆفی زۆر بوون ماموسا مەلا باقر بە یـەک چـاو بە مێهرەبانییۆ تماشای ئە کردن . وە دڵسۆزی هەمو لایە بوو وە ئەوانیش هەردوو لا زۆر موریدی ماموسا بوون بە گوێیان ئەکرد ،ماموسا لە مزگەوت بالکا بەیانیـان خەتمەو تەلیلەی ئەکرد . لە ساڵی ١٣١٥ ش یـا تـا ساڵـی فـەوتـی ١٣٥٠ ش بەردەوام ٣٦ ساڵ ئەم خەتم و تەلیلەیە ئـەکـرد . منـیش ئـەو یاسـای ئـەومـە ئەشێوان تا دەساڵی لە بالکا مەلا بووم تا دەساڵیش لە مە ریوانا خەتمەو تەلیلەم ئەکرد . سۆفی و دەروێش وەک یەک لە بالکا ئەهاتن بۆ خەتم وتەلیلە دەروێـش موسەفایە بوو لە بالکا هەر ئەو بەردە خەتمی ئەگێرا . ماموسا مەلا بـاقر کارێـکی بووایە دەروێشی ئەنارد بۆ دوڕۆ بۆ خزمەت شێخ عوسمان ، ئەو دوو زاتە بە ڕاسی و ڕوخۆشی و قسەی خۆش وە ڕەفتار و گوفتاری جووان هەمو کەسـێکیان دەسـە مۆی خۆیان کردبوو ، هەر کەس ئەڕۆی بـۆ خزمـەتیـان وای ئـەزانـی لـە خـۆی خۆشەویس تریان نیە . وەکو سەعدی فەرمویەتی : لطف کن لطفی که بیگانه کنـد حلقه به گوش .

نەوان وەها بوون بۆ خاس و بۆ عام خووا سەربەرزیان کا ڕۆژەکـەی قیام
جەزایان باتۆ بە مـــەیلی خـۆیان ئیمەش حەساو کەن لە دەسەی خۆیان
مامۆسا مەلا باقر دوو خەسڵەت جوانی بوو دەرسە بۆ ئیمە ١- نەیفەرموو :هەرچی خراوەیان لە گەڵا بکردایەم حەواڵەی خوام نەکرد بە قازانج بۆی تەواو نـەکـردم ٢- لە گەڵ هەر کەسێ ناکۆکیمان بووایە لە خۆم گەورەتر یـا چکۆلـەتـر بووایـە حەتمەن من لە پێشا ئەووم ئاشتۆ نەکرد .
ئاشتی خوازی وا دە س کەس ناکەوێ خۆزگەم بەو کەسە شوێنی نەکەوێ

## (پیاو ماقوڵی زۆر ئامشەوی بالکیان کردووە)

مـەسـەلـەن حـەزەراتـی شـێخەمورشـیدەکـان بیـارە هـەرچواریـان شـێـخ ضیـا ء الـدیـن و شێخ نەجمەالدین وە شێخ علاءالدین وشێخ عوسمان علـیهم السلام هاتوو چوی بالکیان زۆر کردووە وشێخی ضیـا ءالدین کە ساڵی ١٣١٨ ق فەوتی کردووە ئەووەڵ جار کە هاتووە بۆ بالک کە لەو وەختا مەریوان عەشـایەری بووە تاڵان و سوتان دێکان مە ریوان زۆر بووە فەرمویەتی : من خەتێکم کێـشاوە بە دەور بالکا بووە بە قەڵای قاییم بۆ بالک کە لە سوتان و تاڵان بێوەی بێ هـەر تا نیستە هەر وا بووە کە ساڵی ١٣٨٩ ش

هەتا هەتایە هەر وەها ئەبێ قەڵای ئەولیا تێک چونی نابێ

ساڵی ڕوسەکە ساڵی ١٣٣٥ بووە دێهات مەریوان زۆریان سـوتاوە بالـک هـەر نەسوتاوە ، (دارسان نێعمەتێکی گەورەی بێ زەحمەت و پـڕ خـێر و بـەرەکـەتـی کوردەواری یە) لە سەر دەوڵەت و میللەت لازمە چاودێـری بکـەن وە بـەرگیـری باشی لێ بکەن لە ئافەت و فەوتانی ، حەیف و خەسار لە زەمان ڕەزا شاو حەمـە ڕەزای کوریا میللەت ئەم کوردوستانە بێ ڕەحمانە بەر بونە ئەم دارسـانە بـێجگە لەوە کە ئەیان کرد بە گەڵاو هەمیشە حەیواتیان تیا ئەلەوەڕان وە ئەیان بـڕی بـۆ سوتان بۆ نان و چێشت وە بۆ خۆ گەرم کردنەوەی زسان وە بۆ ڕۆشنایی ماڵەکان . بە بار ئەیان برد بۆ شار لە هەمو لایەکۆ بۆ فرۆش وە بەویشە وازیان نـەئـەهـێنا ئەیان کرد بە زوخاڵ هیچ بیریان نە نەکردۆ کە ئەمە بێ ڕەحمیـیـە و نـاڕەوایـە و

حەرامە کە هەزاران گیان دار وەکو کرم و مێلورەیان ئەسوتان تا تایە زوخاڵیان بە دەس ئەهانی خوا بە ئاشکرا لە بەر چاو هەمو کەسێکا تۆڵەی لێ ئەسەندن بێجگە لەوە کە خۆیان و سەروگوێیان و دڵیان وەکو زوخاڵ ڕەشۆ بوبو هەرتا بێ ڕەجاڵ تر ئەبوون ، ئەم دیوە یەکێ لەوانە دەوڵەمەن بن و ئیسراحەت کەن تۆ نەت دیوە و من دیومە کە گرانی زۆری ئەهانی بۆ مەریوان ئەڕۆین بۆ کاروان خەلەو خوێ چەن ووڵاخیان پێ بوو ئەونە بار زوخاڵیان ئەبرد ئەیان فرۆشت بۆ خەرجی خۆیان و بارەکەیان . پیاوە زاناو ژیرو ژوڵەکان زۆر لە سەر ئەم دارسانە بە توندی هاتونەسە جواب وەکو ڕەحمەتی مەلا حەمە سادیقی نگلی کە دەسەیە شێعری زۆر جوانی نوسیوە لە دیوانەکەیا بۆ سەرکوت کردنی نگلی لە سەر ئەو دارسانە کە ئەیان بڕی ئەیان کرد بە زوخاڵ . ئەمە یەکێ لەو دەسە شێعرەسە
کە چێ بۆ بەهەشت بە فەرزی مەحاڵ شەجەرەی توبا ئەکەن بە زوخاڵ
نۆخەی کە ئەوت وگاز و جە نگەڵبانی لە ئێرانا بەرگری لە بڕین و فەوتانی دارسانەکە ئەکەن لە عێراق و باقی دەوڵەتە کانیش هەر وایە ، لە عێراقا ئیدارەی غابات هەیە ، غابات یانێ جەنگەڵ و دارسان.
( کۆتایی ئەم کتێبە کە بەشی پێنجەمە لە کتێبی تەئریخی بە نرخ ) باسی کەریم خان زەندە کە بەشێ بوون لە تاییفەی لەک ، کە تایفەیە گەورە بوون لە لوڕ، دێیەکیان بووە بە ناو ( پەری ) لە لای دێکان مەلایەردا کە بە حیوان داری وشوواتی‌یۆ سەرگەرم بون وە لە ئەووە لۆ ناو شۆرەت و ئەهمییەتی وایان ئەبووە .
تایفەی زەند لە گەڵ بازێ لە تایەفەی بەختیاری و لوڕا دووای سەرکەوتن نادر شا بە سەر عەلی مورادخانا بۆ ( دەرگەز) خوراسان کۆچیان پێ کردن ، نادر شا هەر کام لەم تایفانە کە بە کار ئەهاتن بیان کا بە سپای بە خزمەت کاری خۆی قوبوڵی کردن ، کەریم خان زەند و سادق خان برای لەوانە بوون کەریم خان با بێ سەوادیش بوو کە لیاقەتی زاتی زۆر بوو تا ئەرکی سەڵتەنەتی ڕۆیی، بوو بە شای تەواوی ئێران ، وە شیراز کە نزیکی تایفەی خۆی بوو کردی بە پایتەختی خۆی چواردە ساڵ شای تەواوی ئێران بوو ، نیسبەت بە شاکان ئێران زۆر عادڵ و باش

بوو خۆی ناو نا بوو وکیل الرعایا کە زوتر ناوی وکیل الدولە بـووە ، کتـێبی محمـد خانی قاجار لاپەڕەی ٥٨ لەویا عەکسی کەریم خان زەند هەیە کە لە باتی تـاجی شاهی شالی کرمانی وا بە سەرۆ ، ئەو عەکسە لە کتێبی المنجـد یـشا هـەیـە ، بیست سالْ دوای نادر شا ئێران پڕبوو لە هەرج و مەرج و شەڕو شـۆڕ دوای ئـەو بیس سالە کەریم خان بوو بە شای ئێران تا چواردە سالْ ئێرانی دامە زران هەرکە س خەریکی کاسبی خۆی بوو بە ئارامی خێر و بەرەکەتی زۆرۆ بو خۆی و منالـی ، کەسێ زولمی لە کەس نەنەکرد . ئیتر کەریم خان پیر بوو وە ختی کۆچی دوایـی هات لە ڕۆژی ١٣ سەفەری ١١٩٣ ق

عومری تەواو بوو دەرچو لە دونیا          بۆ کەسێ نابێ تا سەر ئەم دونیا

تەئریخ نوسەکان نوسیویانە تەئریخ شای زەندی بە کەریم خان زەند دەسی پێ کرد . وە بەویش تەواو بوو . کە گیانی پاکی دەرچوو قەومەکانی بەر لەوە بیسپێرن بەخاک بە شمشێرۆ بەر بوونە یەک خوێنی یەکیان ڕژاند وە جێگەداری بۆ کەسیان نەبوو بۆیە وا وێلی ولات بوون [1]

مەلا ئەحمەدی گەرمیانی لە مەریوانا بوو ئەیووت زەنـدی لـە کـوفری زۆرن مـن لەوانم لە لەیلاخا هەن وە لە بالکی مـەریوانیـشا هـەن . لـە کتـێبی (المنجـد) دا نوسراوە کەریم خان زەند لە سالی ١٧٠٥ میلادی یا لە دایک بـووە . لـە سالـی ١٧٧٩ عومری تەواو بووە. عومری ٧٤ سالْ بووە لە بەر ئاشتی خوازی پیان ووتوە وکیل الرعایا تاریخی بەنرخی ئەم روداوە دلْتەزێنە ئەنوسم.

حاجی ئەحمەدی ساعدی ئەلمانەیی کە دوکانی لە شاری مەریوانا بو لە خـواری پایەگاکەی بالکو کە ئیسە جوجەسازی‌یە زەوییکی لە بالکی سـەند کـە بیکـا بـە جوجەسازی لە ئاخر مانگی بەهاری ١٣٦٨ شەمسی‌یا دو کاری‌گەری بالکی گرت بە کری ئەو کاری‌یە بو بکەن عەبەی مەحموی حاجی حەمە عەلی. وەلـی حـاجی ڕەشید لە پیشا بیری‌کیان لی دا بیرەکە گەیی بە ئاو ئەو شەوە بە جی‌یان هیـشت

---

[1] - کتێبی محمد خانی قاجاری ئەسلی حەوتم لاپەڕەی ٨٦

بەیانی کە هاتنو بو سەر کار چونەخوار و دەس‌کاری‌تـری بکـەن گـازی بیـرەکـە خەفەی کردن و مردن کە زوریان پیچو نەهاتنە دەرو ئەمینی کوڕی‌حاجی ئەحمەد ساعدی کە ئازرکاریان بو چووە خووار ئەویش گاز گرتیو مرد بـە زەحمـەتـی زور لاشەکانیان هانینە دەرو لاشەی عەبە و وەلیان لە پیرم‌موحەمەد بالکا بە خاکی‌یان سپاردن لاشەی ئەمین‌یان بردو بو مەریوان نیتر ئەو بیرو زەویە هەروا ماوە.

ئەم بەشی پێنجەمە لەم کتێبی تەئریخی بە نرخە تەواو بوو لە مەحەلـەی بەهاران لە شاری سنە ١٣٨٩ / ٩ / ١٧

# ناوەڕۆک

# ناوەڕۆک